یەکەمین گۆڤاری کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی لە کوردستاندا

37

لە پێناو گەلێکی خاوەن بڕیاردا

# بڕیار



مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی

سالی چوارەم حوزەیرانی - ٢٠١١

## پێشکەوتنەکان بەئازارن!

## ئێوە لە دڵی بڕیاردا

خۆشم دەوێیت!

ڕۆشنبیر کێیە؟



مرۆڤ و بەهرەکانی

گوڵدانی بیرەوەرییەکان

خێزان و پشووی هاوین

ئێوە لە هیچتان کەم نیە!

The first Magazine Specialized in Management and Human Development in Kurdistan

لە پێناو گەلێکی خاوەن بڕیاردا

# بڕیار

مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی

ساڵی چوارەم - ژمارە 37 - حوزەیرانی 2011





نرخ 2500 دینار


Www.bryarmagazine.com




ناونیشانی گۆڤار

سلێمانی - شەقامی سالم -تەلاری سلێمانی مۆڵ- نهۆمی دووەم

بەرامبەر بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردە

٣١٩٣٩٤٦ - ٠٧٧٠٢١٧٨٦٨٢

هەولێر ٠٧٥٠٤٤٦٣٢٣٠

E-mail: bryar@bryarmagazine.com

دابەشکردن

کۆمپانیای پەیپەر

٠٧٧٠٨٦٤٩٢١٠



ئەو کارانەی کە تەنها بۆ بەرژەوەندی خۆمان
ئەنجامی دەدەین، لەگەڵ مردنی خۆماندا دەمرن!
بەڵام ئەو کارانەی بۆ بەختەوەری کەسانی تر
ئەنجامی دەدەین، دوای خۆمان بە نەمری دەمێننەوە!

# ڕۆشنبیر کێیە؟

پێناسەی ڕۆشنبیر، ئەگەر یەکەمینی لیستی ئەو وشانە نەبێت کە جێگەی قسەو باسێکی زۆرن، ئەوا لە ڕیزی سەرەوەی ئەو وشانەدا دێت کە ڕاوبۆچوون و پێناسەی جیاوازی لەسەرەو تا ئێستا لە لای هەمووان بە تەواوەتی یەکلانەبووەتەوە.

بەشێوەیەکی دیکە، پێناسەی ڕۆشنبیریی، خۆی لە خۆیدا بووەتە کێشەیەك بۆ ڕۆشنبیری.

بە بۆچوونی من، دوای خوێندنەوەو موتالآیەکی زۆر جوانترین تاریفو پێناسە بە لای منەوە بۆ ڕۆشنبیر، بریتییە لە پێناسەکەی (تشومسکی) کە دەڵێت: ڕۆشنبیر ئەو کەسەیە کە حەق هەڵدەگرێت، بە ڕووی هێزدا!

(المثقف من يحمل الحق فى وجه القوة).

ئەم کارەش واتە هەلگرتنی حەق و ڕاستی لە بەرامبەر ئەو کەسانەدا کە هێزیان هەیەو بەرەو ڕووبەڕووبوونەوەی هێزو دەسەڵاتو ستەمو زەوتکردنی ئازادییەکان بە فیکرو ڕۆشنبیری و ڕێنمایی بەرزو چارەسەری ماریفی و ئاکاری جوان و هەڵسوکەوتی شارستانی کارێکی مەزنەو هەروا ساناو ئاسان نییە!

ململانێی نێوان خامەو تفەنگ، ژیری و ماسوولکە، ڕێبازو مەسڵەحەت، سەختترین ململانێی دنیایە!

وەها کارێك پێویستی بەوپەڕی ئازایەتی و لە خۆبووردوویی و یەکلابوونەوە بۆ سەرخستن و پارێزگاری لە هەقی دەوێت.

ئەمجۆرە ڕۆشنبیرەش کە هەق وایە تەنها پێناسەی ڕۆشنبیر بە ئەم بدرێ، بەرهەمی ئەزموونێکی درێژی دەوڵەمەند بە زانست و ماریفەت و باس و لێکۆڵینەوەیەو زێدەی پەروەردەو ئایدیاو بەرنامەو ئامانجێکی دیاریکراوە.

ئەو کات دەزانین کە ژمارەی وەها ڕۆشنبیرێك لە نێو حەشاماتی ڕۆشنبیریی وەهمی و بووکەڵەئاساو خوڵاەو نۆکەردا، زۆر کەمەو لە کۆمەڵگای سادەو نامۆ بە شارستانییەتدا، مافی مرۆڤو دادوەری کۆمەڵایەتی و بەها بەرزەکانی مرۆڤایەتی، دەگمەن و دانسقەیە!

گەورەترین بەڵاش کە بەرەو ڕووی کۆمەڵگە دەبێتەوەو هەندێجار بەرەو بێهیوایی دەبات، بوونی ئەو بەناو ڕۆشنبیرانەیە کە قەڵەمەکانیان بۆ خزمەتی بەرژەوەندی تاکەکەسی، یاخود کەسانێك بەکاردەهێنن، بۆ گەیشتن بە مەرامی تایبەتی خۆیان، هەموو بەهاو بنەمایەك وەلادەنێن!!

زۆرجاریش بەداخەوە، لە بری پارێزگاری لە مافو داواکارییەکانی گەل، دژ بە هیواو ئاواتەکانی دەوەستن.

لەم جیهانی سەرمایەدارییەدا، تا دێت ئەرکی ڕۆشنبیری ڕاستەقینە زەحمەتتر دەبێت، بۆ گەیاندنی ڕاستییەکان و پەخشکردنی زانیارییەکان بەربەستی زۆری دێتەڕێ.

چونکە سیستەمی سەرمایەداری و دیکتاتۆری دەیەوێت هەموو شتەکان بۆ خۆی قۆرخ بکات، کە ڕۆشنبیرو ڕۆشنبیریش بەشێکە لەو شتانە.

بەڵام ئەمەیان کارێکی مەحاڵەو کۆت و بەندکردنی هزرو ژیری و بیرکردنەوە زۆر ئەستەمەو هەرگیز سەرکەوتن بە دەست ناهێنێت.

دەکرێت جۆرە ڕۆشنبیریی و ڕاگەیاندنێك دروست بکرێت کە بۆ باڵای سوڵتانێك، یا دەسەڵات و هێزێك، گۆرانی بڵێ و هەر ڕۆژەی بە ئاوازێك بێتە سەما، بەڵام وەها چەشنێك لە ڕۆشنبیریی و ڕاگەیاندن ناتوانێت پێگەیەکی جەماوەری بۆ خۆی دروست بکات و تەنزیری مافو داواکاری و کێشەکانی کۆمەڵگا بکات.

کەواتە ئێمە بەرامبەر دووڕیانێکین کە پێویستە یەکێکیان هەڵبژێرین، یا ڕۆشنبیری و کەڵچەرێکی ئازادو هەڵقوڵاوی ناخی تاکەکانی کۆمەڵ و گوزارشکار لە حەزوو ئارەزووەکانی ئەوان، یاخود پاشکۆیەتی بۆ ئەو سیستەمانەی مامەڵەی هەموو شتێك دەکەن، ئەگەر خامەو بیرو ئەندێشەش بێت، چونکە ئەوان تەنها پوڵ و پارە شك دەبەن.

هاوکات دەبێت پێناسەی ڕۆشنبیرمان زۆر لەوە لا گەورەتربێت کە هەر کەسێك چەند کتێبێکی خوێندەوەو چەند چاوپێکەوتنێکی تەلەفزیۆنی لەگەڵدا کراو چەند گوتەیەکی قەڵەوی لە دەم هاتنەدەر، ئیتر تاجی ڕۆشنبیری بخرێتە سەر، بەڵکو پێویستە ئەو کەسانە بە ڕۆشنبیر لە قەڵەم بدرێن کە وێڕای خوێندنەوەو دیراسەیەکی قوڵ و فراوان، خاوەنی پڕۆژەی مەعریفی خۆیەتی، چ بۆ خۆی، یا بۆ نەتەوەو گەل و وڵات.

بەم کارەش لە زۆری و بۆری و ناوی زل و دێی وێران، قوتار دەبین!

# کارگێڕی بە گوفتار

یاری بە دەنکە شقارتەکان مەکە، بۆنەوەی لە داهاتوودا ناچاری کوژاندنەوەی ئەو ئاگرە نەبیت، کە دایدەگیرسێنیت.

**بریان روبنسون**

باشترین جۆری سەرکردایەتی کاریگەر، سەرکردایەتییە بە پێشەنگی جوان، نەك تەنها بە دەرکردنی بڕیارەکان.

**جون - سی - ماکسویل**

ناتوانی ناوبانگێکی باش دروست بکەیت، بە هۆی ئەو کارانەوە کە لە داهاتوودا ئەنجامیان دەدەیت!

**هنری فۆرد**

ئەگەر مارێکت بینی، دەستبەجێ بیکوژە، لیژنە دروست مەکە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ مارەکاندا!

**رۆس پیرۆت**

سەرکردایەتی بەکارهێنانی دەسەڵات نییە، بەڵکو بەخشینی دەسەڵاتە بە کەسانی تر!

**بیکی برودین**

بە بەهای (١٠٠) دۆلار کات بە فیڕۆ مەدە، لە بڕیارێکدا کە یەکسان بێت بە (١٠) دۆلار.

**ماکسویل**

# کارگێڕی بە چیرۆك

## تێکۆشان بە ئاڕاستەیەکی هەڵەدا

دەگێڕنـــەوە خانمێـــك تووتییـــەك لە فرۆشـــیارێکی باڵنـــدە دەکڕێـــتو دوای ئـــەوەی دڵنیا دەبێت لـــەوەی تووتییەکەی قســـە دەکات، لـــە قەفەســـێکی جوانـــدا تووتییەکـــە دەباتەوە ماڵـــێ، دوای چەند ڕۆژێك خانمەکە بە نابەدڵییەوە گەڕایەوە فرۆشگەکە، فرۆشیارەکە لێی پرسی: ئاخۆ بۆچی ئاوا نیگەرانە؟

لـــە وەڵامدا گوتـــی: تووتییەکە قســـە ناکات!

فرۆشـــیارەکە لێی پرسی: ئەها، ئەرێ ئاوێنەت بۆ تووتییەکە داناوە؟

- نەخێر!

- کەواتە خەتای ئەومیە، پێویســـتە بە زووترین کات ئاوێنەیەکی بۆ بکڕیت، چونکە تووتییەکان زۆریان ئاوێنە خۆشدەوێت!!

خانمەکە خێرا ئاوێنەیەکی بۆ تووتییەکە کڕیو لە قەفەسەکەیدا بۆی هەڵواسی، بەڵام دیسان تووتییەکە هەر قسەی نەکرد.

دووبـــارە گەڕایەوە لای فرۆشـــیارەکەو پێـــی گوت: وێـــڕای ئەوەی ئاوێنەشـــم بۆ ئامادەکرد، بەڵام ئەو هەر قسە ناکات!

فرۆشـــیارەکە: زۆرباشـــە، بـــەڵام ئایا قەفەسەکەت بۆ پڕ لە گوڵ کردووە؟

خانمەکە گوتی: نەخێر.

فرۆشـــیارەکە: نابێـــت، ئـــەم تووتییە ئارەزوو دەکات لە ژینگەیەکی پڕ لە گوڵو گوڵزاردا بژی، پێویستە قەفەسەکەی بۆ پڕ بکەیت لە گوڵ.

دواتـــر خانم چەندیـــن چەپکە گوڵی ڕازاوەی کـــڕیو لـــە نێو قەفەســـەکەو لە دەوروبەریدا بە جوانی داینان!

بـــەڵام دیســـان تووتییەکـــە وتەیەکی نەدرکان!

دوای هەفتەیـــەك خانمەکە بەوپەڕی خەموپـــەژارەوە هاتـــەوە لای فرۆشـــیار، کاتێك فرۆشیارەکە پرسیاری لێکرد، بۆچی وا خەمبارو دڵتەنگو نیگەرانیت؟

خانم لە وەڵامدا گوتـــی: تووتییەکەم مرد!

فرۆشـــیارەکە بە پەرۆشەوە پرسیاری لێکـــرد: ئـــەرێ تووتییەکە پێـــش مردنی هیچی نەگوت؟

خانمەکە: بەڵێ بۆ یەکەمجارو دواجار قسەی کردو دوا وتەی درکاند!

- ئەی چی گوت؟

- وتـــی: ئـــەرێ لەم ماڵـــەدا خواردنو خواردنەوە دەستناکەوێت؟

**لەم چیرۆکەوە فێردەبین:**

١- هەندێجـــار هەوڵدەدەیـــن، ماندوو دەبیـــن، بـــەڵام هەوڵەکانمان بێ ســـوودە، چونکە گرفتەکەمان نەزانیوە.

٢- یەکـــەم هەنـــگاو بۆچارەســـەر، دۆزینەوەی گرفتەکەیە، دواتر چارەســـەر دیاری دەکرێت!

٣- هـــەر کاتێك نەمانتوانی کێشـــەکە دیـــاری بکەیـــن، ئـــەوا هـــەر هەوڵێك کە دەیدەیـــن لە پێناو چارەســـەردا بە هەدەر دەچێتو هیچ بەرهەمێکی نییە.

٤- ماندووبـــوون ئەنجامـــەکان دیاری نـــاکات، بەڵکـــو کاریگـــەری چارەســـەرو بەرنامەی بەهێزە کە چاوەڕوانی ئەنجامی باشیان لێدەکرێت.

٥- پێویســـتە بۆ چارەســـەر پرس بە کەســـانی پســـپۆڕ بکەیـــنو زۆرجاریش وا پێویست دەکات لە یەك کاتدا لە پرسوڕای چەند کەسێك سوودمەند بین.

٦- تێکۆشـــانو هەوڵدانو ماندووبوون بـــە ئاڕاســـتەیەکی هەڵـــەدا وزەو توانـــای زۆرمـــان بـــە زایە دەباتو زیانـــی ماددیو مەعنەوی زۆرمان لێدەدات.

٧- با چارەســـەرەکانمان مەنتیقی بنو بە پێی زانیاریو داتاو لێکۆڵینەوەبنو هەر لە خۆمانـــەوە بە مەزەنـــدەو گۆترەکاری چارەسەر دیاری نەکەین.



ئا: هەڵگورد مەسعود شاکر

# سەرکردایەتی

## سەرکردایەتی لە نێوان بۆماوەییو دروستبووندا:

بەشی دەیەمو کۆتایی

**سەرکردایەتی لە نێوان بۆماوەییو دروستبووندا:**

بیروبۆچوونەکان جیاوازن، سەبارەت بەوەی ئایا سەرکردە لە دایك دەبێت، یاخود دروست دەبێت؟ ئێمە لەم باسەدا هەوڵدەدەین شیکردنەوەیەکی ڕوونتر بکەین بۆ بۆچوونە جیاوازەکان لەمەڕ چەمکی سەرکردایەتیو یەکلاییکردنەوەی ئاراستەکانی دووبەرە جیاوازەکە، ئەمەش لە سێ خاڵدا ئاماژەی پێدەکەین:

**یەکەم: بیروڕاجیاوازەکان لەمەڕ سەرکردایەتی:**

ئێمە لەم باسەدا لە بەزامبەر دوو بۆچووندایـن، کە هەندێکیان پێیانوایە هەندێ کەس هەر کە لە دایك دەبن بە زگماکی خاوەنی خەسڵەتی تایبەتمەندیی سەرکردایەتین، بەڵام لە بەرامبەردا هەندێکی تر پێیانوایە ئەمە شتێکی مەحاڵە، وەکو ئەوەی د.أبراهیم فقێ دەڵێت: "ئەوانەی دەڵێن سەرکردەکان لە دایك دەبن دروست نابن، ئەمە بۆچوونو دەربڕینێکی کۆنە، ئەمەش لە سەدەکانی ڕابردوو زۆر بەربڵاوبووە، لەو سەردەمانەی کە پادشا هەر بە پادشایی لە دایك دەبوو، شازادەش هەر لەناو بێشکەکەیدا هەڵگری نازناوەکەی بوو، بەڵام ئێستا ئەم بۆچوونە متمانەی خۆی ونکردووە، چونکە چەندین سەرکردە لە جیهان دەرکەوتن بەبێئەوەی کوڕە پادشا بنو لە خۆشگوزەرانیدا بژین".

"تیۆری کۆن بۆ بیرۆکەی سەرکردایەتی وای بۆ دەچێت کە سەرکردەکان لە دایك دەبن، دروست ناکرێن، بەڵام تیۆرە نوێیەکان ئەم بیرۆکەیان ڕەتکردەوەو جەختیان لەسەر ڕۆڵی پرۆسەی ڕاهێنان کرد لە سەرکردایەتیدا، ئەمەش بە پێی ئەوەی سەرکردایەتی شێوازێکە کە دەکرێت ڕاهێنانی لەسەر بکرێتو ئامادەکردنی ئەو تاکانەی کە دەخرێنە ژێر باری ئەم ڕاهێنانانە بۆ پۆستەکانی سەرکردایەتی". دژایەتییەکی ڕوون هەیە لە نێوان ئەم دوو بۆچوونەدا، هەروەها هەریەك لەم دوو بۆچوونە کارەکە یەکلایی دەکاتەوە بە یەك ئاڕاستەدا.

ئەوەی دەیبینینو لێی تێدەگەین لەم دوو بۆچوونەدا، ئەوەیە هەردووکیان بە ڕەهایی بیرۆکەکانیان خستۆتەڕوو، بەڵام من لێرەدا پێموایە دەکرێت هەردوو بۆچوون وەربگرینو بەڕاستیان بزانین، واتە شتێکی سروشتییە ئەگەرچی کەسێك لە باوانییەوە دەسەڵاتی بۆ بمێنێتەوە لە هەمانکاتدا ببێتە سەرکردەیەکی کاریگەرو لێهاتوو، لەگەڵ ئەوەی ڕەنگە باوکی کەسێکی بەناوبانگ نەبووبێت، بە هەمان شێوە بۆ ئەو کەسانەش دەگونجێت ببن بە سەرکردە، ئەگەرچی ڕێگاو ئاسانکارییەك بوونی نەبووە بۆ ئەوان، تاوەکو پۆستی سەرکردایەتی وەربگرن، جگە لە حەزو هەوڵەکانیان نەبێت، بەڵام لە هەمووی گرنگتر ئەوەی کە لە هەردوو بۆچووندایە دەبێت ئەو کەسانە هەوڵ بدەنو ماندووبنو ببەخشن بۆئەوەی بە لێهاتوویی بگەن بەو شوێنە، بێگومان سەرکردایەتیش شایەنی ئەوەیە ئازارو ناخۆشی لە پێناویدا بچێژیت، بۆئەوەی مانای سەرکردایەتیکردن بزانیت.

**دووەم: هەنگاوەکانی بوون بە سەرکردەیەکی کاریگەرو سەرکەوتوو:**

١- لێهاتوویی: "بڕوا بەخۆبوون بۆ سەرکردە بەس نییە بۆ ئەوەی ببێتە سەرکردەیەکی کاریگەر، بەڵکو پێویستە خاوەن زانیاریو لێهاتوویەکی باش بێت" بۆ گرتنە ئەستۆی ئەو بەرپرسیارێتییە، چونکە "هەبوونی ئەم سیفەتە لە سەرکردە دڵنیامان دەکاتەوە لەوەی کە ئێمە سەرکردەیەکی باشمان هەڵبژاردووە، تاوەکو ئامانجەکانمان بەدەست بهێنێت" ئەمە جیا لەوەی لێهاتوویی یەکێکە لە بنەما گرنگەکانی سەرکردەی کاریگەر.

٢- توانای گۆڕانکاری: بێگومان دەبێت سەرکردە توانای گۆڕانکاری کردنی هەبێت، لەسەر ئەو قەوارەی کە دەسەڵاتی بەسەرییەوە هەیە، بەشێوەیەکی ڕاستو دروست، چونکە گۆڕانکاری بۆخۆی یەکێکە لە ئەرکەکانی سەرکردە، بەڵام گۆڕانکاریش "یاساو پرەنسیپو بنەمای تایبەتی خۆی هەیە کە پێویستە درکی پێ بکرێت، بۆئەوەی بە باشی لە چەمکی گۆڕانکاری تێبگەین، ئەگەرنا دەبێتە هۆی جۆرێك ناتەواوی لە کارەکانیدا" ڕەنگە بەرەو ئاڕاستەیەکی زیانبەخش بڕوات، چونکە گۆڕانکاری ئەو ئەو ئاڵوگۆڕە هەست پێکراوەیە کە لە بەشەکانی دەزگاکە دەست پێدەکات، جا ئەم گۆڕانکارییە، تووشی ناکۆکی دێت، یان خۆگونجاندن"

٣- دادپەروەری: پێشەوا عەلی (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرمووێت: سەرکردەی ڕاستەقینە ئەو کەسەیە کە دوای مردنیشی ناوەکەی هەر بە دادپەروەری بمێنێتەوە، بۆ هیچ سەرکردەیەك نالوێ، یاخود ناچێتە سەر ئەگەر دادپەروەری بە یەکێك لە کارە سەرەکییەکانی خۆی نەزانێت، ئەگەرچی

هەموو سەرکردەیەکی ژیرو لێهاتوو بە باشی درك بەوە دەكات، كە دادپەروەری نهێنی سەركەوتنی زۆربەی دەوڵەتو ڕێكخراوو كۆمپانیاكانی جیهانە، بەڵام ئەوەی گرنگە چۆنیەتی كاركردنە بە چەمكی دەسەڵاتو خۆگونجاندن لەگەڵ باروودۆخەكانو لەبەرچاوگرتنی هەموو پێداویستییەكانی كۆمەڵگاكەی كە لێرەدا ڕۆڵی دادپەروەری دەست پێدەكات.

٤- وتاربێژیی: کاریگەری دروست نابێت لەسەر هەستی تاکەکان بەبێ هەبوونی هونەری وتاربێژیی، بۆیە ئەگەر تەکنیکی سەرنجراکێشان بە کارنەهێنرێت لە لایەن سەرکردەکانەوە، بێگومان ناتوانن ببن بە خاوەنی جەماوەری تایبەتی خۆیان، ئەمەش لە ڕێگای پێدانی متمانە دەبێت "بەڵام سەرکردەکان دەبێت لە یادیان بێت کە بنیادنانی متمانەی ڕاستەقینە هێندە ئاسان نییە" ئەمە شتێکی بەڵگەنەویستە ئەگەر جەماوەر متمانەی پێت نەبێت سەرکردەکان ناتوانن شوێنکەوتووی دڵسۆزو کارامە بۆخۆیان فەراهەم بکەن.

٥- باوەڕدار: ئەم خاڵە یەکێکە لە گرنتییەکانی سەرکەوتنی سەرکردەکان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، دیارە نموونە گەلێکی زۆریش هەن بەتایبەت لە بواری سیاسیدا، ئەوەتە لە تورکیا دوای پەنجا ساڵ لە فەرمانڕەوایی کردنی کەمالیستەکان لە تورکیا هاتنەخوارێ لە دەسەڵات، یەکێك لە هۆکارەکانیش مەسەلەی ئایین بوو. ئۆباما یەکێك لەو بەهایانەی جەختی لەسەر دەکاتەوە لە وتارەکانیدا ئاینی مەسیحییە، بە جۆرێك ئێستا یەهودییەت پێیانوایە مەترسییەکی گەورە هەیە لەسەر جولەکەکان لە جیهان. جا ئەگەر ڕۆژئاوا هەستی بە گرنگی ئاینو باوەڕداری کردبێت، ئەی دەبێت ئایین چەندە گرنگ بێت بۆ کیشوەرێك کە تەنانەت گوێ بۆ کەسێکی ئاسایش ڕاناگرن ئەگەر هەست بکەن ئایین بەهاییەکی ئەو تۆی نییە لە لای ئەو کەسە!

هەر یەك لەم خاڵانەی سەرەوە بۆ خۆی جۆرێکە لە هونەرو لێزانین، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ خودی سەرکردە، ئایا بەکاریان دەهێنێت، بە تایبەتی "هونەری ڕێکخستنو فەرمان دەرکردنو پشتبەستن بە لێهاتوویی کەسانی تر، هونەری مامەڵەکردنی لەگەڵ سەرکردەکانی تری هاوتای خۆی" لە بەدەستهێنانی ئەم هونەرانەش خولی ڕاهێنانو خوێندنەوە ڕۆڵی گەورەیان هەیە.

سێیەم: جیاوازی نێوان سەرۆکو سەرکردە:

ئەگەرچی پسپۆڕانی بواری کارگێڕی پێیان وایە سەرکردەو بەڕێوەبەرو سەرۆك هەر یەکەیان جۆرێکن لە سەرکردایەتیکردن، بەڵام واقیع شتێکی ترمان پێ دەڵێت، ئەویش لە شێوەی هەڵسوکەوتو کارو بڕیارەکانیان جۆرێك لە جیاوازی دەردەکەوێت لە نێوان ئەو سێ پۆستەدا، بەتایبەت لە نێوان سەرۆکو سەرکردە، ئەم جیاوازییەش خۆی لە چەند خاڵێکدا دەبینێتەوە.

دیارە ئێمە بەراوردکارێکی ترمان کردووە بۆ ئەو پۆستە، بەڵام ئەمیان لە ڕوانگەی تیۆرەکان بوو، ئەویشیان لە ڕوانگەی پسپۆڕانی بەڕێوەبردن، بە تایبەت شارەزایانی (گەشەپێدانی مرۆیی).

جیاوازی نێوان سەرۆکو سەرکردە:

سەرۆك: ئەگەر کەسێك لە فەرمانی لابدات، یان سەرپێچی بکات، زۆر توندوتیژە.

سەرکردە: کەسێکی نەرم و نیانە، هەوڵدەدات لەوە تێبگات کە بۆچی ئەم هەڵەیە ڕوویداوە.

سەرۆك: زیاتر حەز بە سەرۆکی دەکات، نەك سەرۆکایەتی کردن.

سەرکردە: هەمیشە بە سیفەتی سەرکردایەتیکردن لەگەڵ شوێنکەوتووەکانی ڕووبەڕووی باروودۆخەکان دەبێتەوە.

سەرۆك: بەردەوام بیری شوێنکەوتووەکانی دەخاتەوە کە ئەو سەرۆکەو گوێڕایەڵی پێویستە، ئەگەرنا سزا چاوەڕێ دەکات.

سەرکردە: خۆی بە بەشێك لە کۆمەڵەکەی دەزانێت، چونکە هەردوولایان ئەندامی یەك کۆمەڵگان.

سەرۆك: بڕیارەکانی ئەمڕۆ ناخاتە سبەینێ، واتە خێراو بە پەلەیە.

سەرکردە: لە بڕیارەکانیدا زۆر پەلە ناکات، بیردەکاتەوە پاشان بڕیار دەدات.

سەرۆك: ڕاوێژوگفتوگۆکانی زیاتر لەگەڵ ڕاوێژکارو کەسە پسپۆڕەکان دەکات.

سەرکردە: ڕاوێژو گفتوگۆکانی بێجگە لە کەسانی پسپۆڕ، ڕاستەوخۆ لەگەڵ کارمەندەکانی ئەنجام دەدات.

لە کۆتایی توێژینەوەکەماندا گەیشتینە چەند دەرئەنجامێك سەبارەت بە سەرکردەو بەڕێوەبەر، بەم شێوەیەی خوارەوە:

یەکەم: دەرئەنجام:

- لە توێژینەوەکەماندا گەیشتین بە چەمكو پێناسەی نوێتر لەسەر سەرکردایەتی.
- کەسانێکی زۆر هەن دەیانەوێت، ببن بە سەرکردە، بەڵام کامیان دەیانەوێت سەرکردایەتی بکەن، بۆیە ئەگەر ئەو کەسانەی دەیانەوێت لە گروپی دووەم بن، ئەوا پێویستە بە یەکجاری واز لە سەرکردایەتی بهێنن.
- ئەگەر سەرکردە توانای دەزگاکەی ڕزگار بکات لە تەنگژەو باروودۆخەکان، بێگومان دەبێت بە کارێزماو سمبولی دەزگاکەی.
- ئەو بڕیارانەی سەرکردە دەریدەکات، تەنها کار لەسەر داهاتوو دەکات، نەك ڕابردوو.
- ئەرکی سەرکردە سەرەتا لە ڕێبەریکردنی شوێنکەوتووەکانی دەست پێدەکات، پاشان دوایی هەڵدەستێت بە گەرخستنی دامەزراوەکەی.
- لێهاتوویی، کاریگەری، بڕیاردان، کۆڵەکەی سەرکردایەتی کردنن لە هەموو دامەزراوەیەکدا.
- سەرکردایەتی تایبەت نییە بە چەند کەسێکی دیاریکراوەوە، بەڵکو بۆ هەموو کەسێك دەگونجێت ببێت بە سەرکردە، ئەویش بە دەستگرتنو پەیڕەوکردنی یاساو ڕێساکانی سەرکردایەتی لە ڕێگای خولی ڕاهێنانو خوێندنەوەی بەردەوام.
- بەڕێوەبەرەکان ناتوانن ببن بە بەڕێوەبەرێکی لێهاتوو، ئەگەر گەشە بە تواناکانی خۆیان نەدەن، لە ڕێگای خۆ پڕ زانیاری کردنو خولەکانی ڕاهێنان.
- بەڕێوەبەری چالاکو سەرکەتوو، یەکێکە لە هۆکارەکانی پێشکەوتنی وڵاتانی دنیا، چونکە بەڕێوەبەرە لێهاتووەکان بە باشی ئەوە دەزانن کە پۆستی بەڕێوەبەری ئەرکی ئەوان زەحمەت دەکاتو سوکی ناکات.
- دەستپاکیو دڵسۆزی لە کارکردندا نیشانەکانی بەڕێوەبەری سەرکەوتووە.
- بەپێی دەرئەنجامە زانستییە نوێیەکانی جیهان، کە باس لەوە دەکەن ئافرەتیش هاوشێوەی پیاو دەتوانێت ڕۆڵی خۆی ببینێت لە کارەکانی دەرەوەی ماڵدا، بە تایبەت لە بواری بەڕێوەبردندا.
- ئافرەت بەهێزترین هونەری دروستکردنی پەیوەندی هەیە لەگەڵ دەوروبەرەکەی، کە لە هاوتاکەیدا واتە پیاو، ئەم هونەرە لاوازترە، هەبوونی ئەم جۆرە هونەرەشە بووەتە هۆکاری سەرکەوتنی زۆربەی دامەزراوەکانی جیهان.
- ئەگەرچی خاڵی جیاواز هەیە لە نێوان پیاوی سەرکردەو ئافرەتی سەرکردەدا، بەڵام ئەوە نابێتە ڕێگر لەوەی، کە ئافرەت بە کەڵکی بەڕێوەبردنو سەرکردایەتی کردنی ڕێکخراوەکان نەیەت.





# مێژووی پلانسازی شار

ئا: بەهەشت عەلی



بەشی دووەم

﴿إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكًا وَهُدًى لِّلْعَالَمِينَ (٩٦)﴾ آل عمران: ٩٦

بەڕاستی یەکەم خانەوماڵو مەنزڵگەیەك کە بۆ خەڵکی دانرا لەسەر زەوی ئەوەیە لە مەککەدایە کە پیرۆزەو هیدایەتو ڕێنمویی بەخشە بۆ هەموو خەڵکی جیهان).

هەندێ لە ڕاڤەکاران وای لێك دەدەنەوە کە یەکەم ماڵێك (خانویەك) کە لەسەر زەوی دروستکرابێت بەشێوەیەکی ڕەها، وتویانە کە فریشتەکان دروستیان کردووە تەنانەت پێش دروستبوونی ئادەم، ئەو ماڵەش کەعبەی پیرۆزە، کە (بیت المقدس) ٤٠ ساڵ دوای کەعبە دروستکراوە. پرسیار کراوە لە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت) سەبارەت بە یەکەم خانویەك کە دروست کرابێت بۆ خەڵك، فەرموویەتی : (المسجد الحرام ثم بيت المقدس)، پرسیار کراوە ئەی جیاوازی نێوانیان (کات) چەند بووە؟ فەرموویەتی چل ساڵ.

### شارو شارستانیەت لەسەردەمە جیاوازەکاندا:

- لە سەردەمەکانی پێش زایندا شار شێوازێکی ڕێکخراوی هەبووە، زۆرجار بازنەیی بووە، لەبەر هۆکاری بەرگری کردن. وەکو گوندی (جرش) ٧٥٠٠ پ.ز.

شارستانییەتی عێراقی کۆن (٩٠٠٠) ساڵ پێش زاین:

سەردەمی کشتوکاڵ لە وڵاتی ڕافیدەین دەستی پێکردووە، ئەوە یەکەم سەردەم بوو بۆ مرۆڤ بە شارەزابوونی کشتوکاڵ لە ٩٠٠٠ ساڵ پ.ز، پاشان لە ماوەی ٥٥٠٠ ساڵ پ.ز لە گوندی (چەرمو) لە کوردستان لە ناوەڕاستی چاخی بەردینی نوێ گەشەی کرد.

### هەڵهاتنی خۆری شارستانییەت لە عێراقدا:

هەڵهاتنی خۆری شارستانیەت لە عێراقدا لە دەوروبەری ساڵی (٥٠٠٠)ی پێش زاین دەستی پێکردووە، عێراقییەکان بۆ یەکەمجار لە مێژووی مرۆڤایەتیدا لە چارەکی کۆتایی هەزارەی چوارەمی پێش زاین نووسینیان داهێنا، گەشەکردنی ئەم شارستانییەتە نوێیە لە وڵاتی ڕافیدەینەوە پێگەیشتووە، بە چەند هەنگاوێکی جێگیرو بە چەند قۆناغێکی یەك بە دوای یەکدا تێپەڕی، ئەم قۆناغانە لە عێراقدا ، لە لایەن توێژەرە تایبەتییەکانەوە بە ناوەکانی شارەکانو دێهاتەکان ناسرابوون، ئەو شوێنانەی کە بۆ یەکەم جار تیایدا دەرکەوت کۆنترین شارەکانی (حسونە)یەو پاشان (سامرا) و (حلف) و (العبيد) و (الوركا) و لە کۆتاییدا جمدە النصر.

عێراق لە ماوەی ئەم قۆناغانەدا فراوانی کشتوکاڵی بە خۆیەوە بینی، دەستپێکردنی ژیانی شارستانیو پەیدابوونی شارە یەکەمینەکان، بنیادنەرانی شارستانییەت، هەروەها ناسرابوون بە هونەری کانزا کردنو دوورکەوتنەوە لە ڕەوڕەوەی گۆزەگەرو خشتی سورەوەکراویان دروست دەکرد، گالیسکەی خاوەن پێچکە، هەروەها گاسن ( زەوی کێڵەر)، لەسەرو ئەمانەوە کەشتی چارۆکەدار، هەروەها لە سەرەتاکانی ئەم قۆناغەدا هونەری

هەڵکۆڵین ناسرا، هەروەها بینای گشتی دەرکەوت، وەك پەرستگاکان.

نموونەی شار لە عێراقی کۆندا:

شاری ئور لە سەردەمی دەسەڵاتو شارستانییەتی سۆمەرییەکاندا ( ٢١١٣-٢٠٠٦) پ.ز.

شاری بابل: لە سەردەمی دەسەڵاتو شارستانییەتی بابلییەکان (٦٠٤-٥٦٢) پ.ز، یەکێك لە کارە سەرەکییەکانیان دروستکردنی زەقورەبوو، دروستکردنی ژمارەیەکی زۆر لە پەرستگای گەورە لە بابل، هەروەها دروستکردنی شەقامێکی جوان کە ناسرابوو بە شەقامی (الموکب)، مەدخەلێکی گەورەو شکۆدار کە پێیان دەگوت دەرگای عەشتار، کۆشکە گەورەکەی بە باخچە هەڵواسراوەکانییەوە دەکەوتە پشت ئەم دەرگایەوە کە لە سەرچاوە یۆنانییەکاندا ناسراوە بە یەکێ لە حەوت سەرسوڕهێنەرەکانی جیهان.

- لە شارستانییەتی فیرعەونیدا هەندێ شار هەبوو وەکو (تل العمارنه).

- شارستانییەتی یۆنانی ٣٠٠٠ بۆ ١٤٦ ی پێش زاین:

لە شارستانییەتی یۆنانیدا شارەکان کاریگەربوون بە بیروبۆچوونەکانی ئەفلاتۆن، کە بە یەکەم پلانسازی شار لە جیهاندا ناسراوە، لەو کاتەدا ئەفلاتۆن گرنگی داوە بە شوێنی شار، بەرزترین شوێنی هەڵبژاردووە بۆ (ئەکرۆپۆل)، کە بریتییە لە مەڵبەند، یان پەرستگا بۆ پیاوانی ئاینی، شاری دابەش کردووە بە دوانزە بەشی یەکسانەوە لەسەر بنەمای داهاتی وەبەرهێنان نەك ڕووبەر، زەوییەکەی دابەش دەکرد بۆ ٥٠٤٠ (عقار) وە هەموو عەقارێکیش دەکرا بە دوو بەشەوە بەشێکی لەناو شارداو ئەوی تر لە دەرەوەی شاردا، بۆ هەموو هاوڵاتییەك شوێنێکی نیشتەجێبوون لە ناو شاردا هەبوو، شوێنێکی نیشتەجێبوونیش لە دەرەوەی شار، هەروەها دانیشتوانیشی دەکرد بە ١٢ گروپەوە.

ئەم شارستانییە کاریگەربووە بەشارستانییەکانی پێش خۆی لەوانەش: (شارستانییەتی فیرعەونییەکان، فارسەکان، ساسانییەکان).

- بەشێوەیەکی گشتی شار لەسەردەمە دێرینەکاندا لە چوار دەوری سەنتەری شارەوانی، یان دەوری (کەنیسە) دەدات، شار مەیدانێکی سەرەکی گەورەو کۆمەڵێ بازاڕی لە خۆ دەگرت، (الکادرالیه)، یان کەنیسە دەوری کۆکەرەوەی هەبوو لە شارەکاندا، هەندێجار مەیدانی شار تەنها شوێنی بە یەکگەیشتنی جادە لاوەکییەکان بوو لە بچوکیدا، بە دەگمەنیش جادەکان ڕاست بوون، بەڵام جادە سەرەکییەکان دەگەیشتن بە مەیدانی سەرەکی لە دەرگای شارەوە، هەندێجاریش جادەکان دەچوونە دەرەوەی سنوری دیواری شار، (چونکە شارەکان بە چواردەوریاندا دیوار هەبووەو دەرگای تیابووە لەبەر هۆکاری ئەمنی).

- شارستانیەتی ڕۆما ( ٧٥٣ — ٥٠٩) پێش زاینی:

گەشەکردنی ڕۆما دەگەڕێتەوە بۆ نزیکەی ساڵانی (٧٥٣- ٥٠٩) پێش زاین، ئەم گەشەکردنەش لەو کاتەوە دەست پێدەکات کە ڕۆمانیا شارەکانی تری داگیر دەکرد، کە لە ئیتالیاوە دەستی پێکرد لە ساڵی (٣٤٣)ی پێش زاین، هەر لەو کاتەوە ڕۆما دەستیکرد بە جەنگێکی گەورەو پرۆکێنەر لە دەرەوەی ئیتالیا، توانی ئیسپانیاو ئەڵمانیاو جەزائیرو سوریاش داگیر بکات.

کاتێك کە باسی پلان دەکرێت لە پێشدا باسی ئیدارە دەکرێت، هەر بۆیە ڕۆمانییەکان شارەزابوون لە پلانو پلانی ڕۆمایان دانا کە لە ٧ گرد پێکهاتبوو، یەکەم ماستەرپلان بوو کە کرا.

لە سەرەتادا پلان بەشێوەی تۆڕی بوو لە ڕۆما، پاشان پێشکەوتنی بە خۆیەوە بینی، لەوەوە بیرۆکەی گۆڕەپانی سەربازی لێوە پەیدا بوو.

پاش ئەوە مێژووی (ئیپۆدەمۆ دەملێتۆ) دەست پێ دەکات کە باسی دابەشکردنی ناوچە (زۆن)ەکانی کردووە لەوەشەوە بیرۆکەی شورا لای ڕۆمانییەکان دروست بوو.

٤٢ ساڵ پێش زاین، ئاگر بەربوو لە ڕۆماو دوای ئەوە دووەم ماستەر پلان بۆ ڕۆما کرا کە شورای هەبوو ١٨ کم بوو.

مانەوەی هەموو ئەو هونەرانەی بیناسازی ڕۆمانی لە هەڵکۆڵینو زەخرەفەو تەلارسازی دەگەڕێتەوە بۆ فەڵەمڕەوی دیکتاتۆرانەی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی لە سەرانسەری سنوری ئیمپراتۆریەتەکە، شارستانییەتی یۆنان بە پایەیەکی بنەڕەتی دادەنرێت لە شارستانییەتی ڕۆمانیداو بڵاوەی کردووە بە ناو شارستانییەتی ڕۆمانیدا، ئەمەش بە ڕوونی لە پەرستگای ڤینۆسدا دیارە کە وەکو پەرستگا یۆنانییەکان دروستکراوە، هەروەها تەلارسازی ڕۆمانی هەموو توخمەکانی لە شارستانییەتی یۆنانییەوە وەرگیراوە، پاشان ڕۆمانیا سیفەتێکی تایبەتی پێداوە، ئەم کاریگەرییەی تەلارسازی یۆنانی لە سەر تەلارسازی ڕۆمانی بە ڕوونی دەردەکەوێت لە پەرستگای فورتینا فیرلیس لە ڕۆما کە کۆنترینو جوانترین پەرستگای ڕۆمانییەو بە بایەخترین کارە کە شارستانییەتی ڕۆمانی پێ جیا دەکرێتەوە.

گرنگترین تایبەتمەندیش کە تەلارسازی ڕۆمانی پێ دەناسرێتەوە ڕێگایەکی نوێیە لە دروستکردنی تەلاردا گرتویانەتە بەر:

ئەم شارستانییە کاریگەربووە بەشارستانییەکانی پێش خۆی لەوانەش: (شارستانییەتی فیرعەونییەکان، فارسەکان، ساسانیەکان، یۆنانییەکان).

- لە سەردەمی ڕاپەڕیندا هەوڵی ئاوەدان کردنەوە دەرکەوت کە لاسایی بنەما ئاوەدان کردنەوەکانی سەردەمەکانی پێشوی دەکرد کە هێشتا مابوو، گەڕەکی گەورەو جادەی ڕێکو پێکو مەیدان (گۆڕەپان) دروست دەکران، ڕووکاری قەبارەی بیناکان، لە یەك دەچوون، لەگەڵ ئەوەشدا پایەو فوارەی ئاوو پەیکەریش دروست دەکرا.

- لەسەردەمە کلاسیکییەکاندا شار ڕێکدەخرا لەسەر شێوەی کۆشکی حاکم، بەشێوەیەك کە لە کۆشکەوە جادەکان دەچوون بەرەو مەیدانی شار.

-پلانسازی شار، وەك خۆی مایەوە هەتا ناوەڕاستی سەدەی هەژدە (شۆڕشی پیشەسازی) کە بریتی بوو لە کردنەوەی ڕێگاکانو دروستکردنی گۆڕەپان (مەیدان)، هێنانەدی لێکچوون لە ڕووکاری دەرەوەی بیناکاندا، گرنگیدان بە کۆشكو کەلەپور، ناشتنی دارودرەخت لە گەڕەکە سەرەکییەکانو گەورەکانی شاردا، بەڵام لەگەڵ ڕوودانی شۆڕشی پیشەسازی لە پلانی شاردا گەشەکردنێکی گەورە ڕوویدا، بە دەرکەوتنی چاکسازانو پێشەوایانی پلانسازی.

# کارگێڕی ئیلکترۆنی



نەریمان بەهرام

## پـێشەكـــی:

سەردەم ســەردەمێكی سەیرە، نازانم لە كوێوە دەســت پێ بكەم  وا بە باشی دەزانم سەرەتا بەم وتەیە دەست پێ بكەم كە دەڵێت: (كەســانی بێ ئەزموون، پــارە و پــول بە دوا چارەسەری كێشەكان دەزانن)) (١).

كاتێك سەردانی ماڵەوەم كرد، پیاسەیەكم بــە ناو گەڕەكەكەی خۆمانــدا كرد، لە گەڵ هــەر هەنگاوێــك بیرم دەكــردەوە كە چۆن مرۆڤــەكان لــە ماوەیەكی كەمــدا ڕەنگ و شێوازیان، یان دەنگیان دەگۆڕێت، بەڵام ئەوەی لای من سەیر بوو ئەوە نەبوو كە مرۆڤەكان دەبێت، بۆچی بگۆڕێن! بە بێئەوەی هەســت بكەن لە گۆڕانیان كە ئەمەش بە دوو شــت، یــان ڕوونتر بڵێین دوو هــۆكار كە بریتییە لــە (ئاوێنە، وێنــەكان) كــە گۆڕانی خۆیان دەبینن، ئەگەر ئــەم دوو هۆكارەش نەبوایە ئەوە هەرگیز نازانن چۆن گۆڕاون.

لێرەدا مەبەستم ئەوەیە بۆ دەبێت مرۆڤ درۆ بكات، یان زۆرینەی كاتەكانی بەقســەی بێكەڵك بەســەربەرێت، یان دانیشێت  زەمی ئەم و ئەو بكات، یان ئامادەیە كاتژمێرێك لە بەر ئاوێنە دابنیشێت و گرنگی بە ڕووخسارو پرچی بدات ...هتد، بەڵام ئامادەنییە ڕۆژێك كــە دەكاتــە (٢٤) كاتژمێر لــەم ماوەیە نیو كاتژمێــر بۆ خۆی دابنێــت بۆ بیركردنەوە، یان خوێندنەوەی گۆڤارێك، یان ڕۆژنامەیەك، یان پەرتوكێك.

من دەپرسم!

ئایا بۆ مرۆڤەكان بیر ناكەنەوە؟

ئایــا بۆ مرۆڤەكان ئەوەندەی گرنگی بە ڕووخساریان دەدەن، بۆ گرنگی بە ناوەرۆكیان نادەن؟

دەپرســم بــۆچی مرۆڤەكان جیــاوازی دەكەن؟

ئایا بــۆ مرۆڤە ڕاســتەقینەكان كەمتر دەردەكەون؟

ئەوجارەیان باشــتر دەپرسم بۆ دەبێت هەندێك خوێندكار توێژینەوەی (ســەختە) بێنن كەچی زۆرباشە وەربگرێت؟

ئایــا بــۆ دەبێــت خوێندكارێــك لــە ماوەی یــەك مانگدا، تەنهــا (١٠) ڕۆژ دەوام بــكات، لــە كۆتایی ســاڵیش دەرچوونی زۆر ئاسانتربێت؟

ئایــا گرنگــی توێژینەوە چ ســوودێكی دەبێــت ئەگــەر خوێنــدكار تۆزێــك پێوەی ماندوو نەبێت؟

ئایــا كاتێك مرۆڤێــك  هەڵەیەك دەكات هەمــوو پێدەكەنــن بــە هەڵەكــەی كەچی خۆشیان مرۆڤن هەڵە دەكەن؟

ئەو جارەیان دەپرسم زیاتر دەڵێم كاتێك خوێندكارێك بیركردنەوەیەكی جوانی هەیە، بۆچی بێئەوەی بزانن بیركردنەوەكەی ڕاستە، یان هەڵەیە، ئەوە یەكسەر دەڵێن نابێت، یان بە تۆ ناكرێت سەدان شتی تریش.

ئێمــەش مرۆڤێكــی ســەیرین بۆئەوەی هەڵســاوین بــە توێژینەوەیــەك لــە بارەی (كارگێــری ئەلكترۆنی) كە تا ئێســتا بوونی نییە لە كوردستان، بۆ ئەوەی بوونی هەبێت لە كوردســتان هەڵساوین بەم توێژینەوەیە كە بــاس لە زۆربــەی پێكهاتــەی كارگێڕی ئەلكترۆنی دەكات.

كارگێــڕی ئەلكترۆنی یەكێكە لە بەڕێوە بردنی كارە كارگێڕییــەكان بە هۆی ئامێرە كارەباییەكانــەوە، یەكێك لــە گرنگییەكانی ئەوەیــە بــۆ نموونــە  ئەگــەر (فەرمانێك دەربكرێــت بە نوســراو بۆ شــوێنێك ئەوە ماوەیەكــی زۆری دەوێت تا دەگاتە شــوێنی مەبەســت كەچــی كارگێــڕی ئەلكترۆنــی بــە چەنــد چركەیەك ئــەم كارە جێبەجێ دەكات.

ئێمە لەم توێژینەوەیە باســی كارگێڕی ئەلكترۆنــی دەكەیــن لــە ڕووی (چەمكــی كارگێڕی ئەلكترۆنی، سەرهەڵدانی كارگێڕی ئەلكترۆنــی، پێداویســتییەكانی كارگێــڕی ئەلكترۆنــی، گرنگی كارگێــڕی ئەلكترۆنی، لایەنــی بــاش‌و لایەنــی خراپــی كارگێڕی ئەلكترۆنی...هتد)).

كەواتــە بۆ ئــەوەی هەنگاوێــك بەرەو پێشــەوە بچیــن، دەبێــت ئەو هەنــگاوە بە شێوەیەكی دروست بنێین، چونكە تەواوكردنی

هەنگاوەكانی تر كە ماوە ئەوە نەوەكانمان تەواوی دەكەن، بەڵام ئەگەر هەنگاوەكانمان نادروست بوو، ئەوە نەوەكانیشمان لە سەر هەمان هەنگاوی ئێمە دەڕۆن. جا پێویستە لە سەر هەموومان بۆئەوەی (نەوەیەكی ئەلكترۆنی دروست بكەین)) (TB) دەبێت لە خۆمانەوە دەست پێبكەین.

بەشی یەكەم:

١-١ دیاریكردنی چەمكەكانی كارگێڕی ئەلكترۆنی.

١-٢ كارگێڕی ئەلكترۆنی.

١-٣ كۆمپیوتەر.

١-٤ ئینتەرنێت.

١-٥ كات.

١-٦ تۆڕی گشتی.

١-١ دیاریكردنی چەمكەكانی كارگێڕی ئەلكترۆنی (E-management):

جیهان ڕووبەڕووی پێشكەوتنێكی زۆر بووەتەوە لە ڕووی تەكنەلۆژیاو گواستنەوەی زانیارییەكان، بە مەبەستی سوودگەیاندن، تەكنۆلۆژیا ئێستا بووەتە پێوەرێك بۆ پێوانەكردنی پێشكەوتنی وڵاتێك لەگەڵ دیاریكردنی ئاستی بژێویەكەی، ئەم پێشكەوتنە بووەتە هۆی گۆڕانی زۆر لە چەمكە بەكارهاتووەكان لە ڕووی بەكارهێنانەوە لە ئاستی وڵاتانو ڕێكخراوەكانو تاكەكان، بە جۆرێك جیهان بووەتە گوندێكی بچووك، هەروەها كەمكردنەوەی كاتو شوێن، كە ئەمەش ڕۆڵێكی گەورەی گێڕاوە لە ئاسانكردنی كارەكان لە هەموو ڕووەكانەوە بە تایبەتی لە ڕووی كارگێڕییەوە.

وڵاتان سیاسەتو شێوازی خۆیان دەگۆڕن، تاوەكو بگونجێن لەگەڵ پێداویستییەكانی سەردەم، ئەویش بە بەكارهێنانی ئامێرو ئامرازی پێشكەوتوو لە بەڕێوەبردنی كارەكان، هەروەها بەكارهێنانیان بۆ چاودێری كردنی كارەكانو ڕەواندنی كارەكانی حكومەت، ئەمەش بە مەبەستی بەڕێوەبردنی كارەكانی حكومەت بە شێوەیەكی خێراو ئاسان كردنیان، هەروەها گونجاندنی باروودۆخ بۆ گونجاندنی لەگەڵ پێشكەوتنی سەردەم، تاوەكو وڵات بەرەو خۆشگوزارنییەكی باشتر بڕوات، سیستەمی حكومەت بە سیستەمێكی بیرۆكراتی ناسراوە، ئەویش بە هۆی لاوازیو لەسەرخۆ بەڕێوەبردنی كارەو هەروەها خراپ گەیاندنی خزمەتگوزارییەكان بە تاكەكانی وڵات، سروشتی حكومەت بە شێوەیەكی گشتی بریتییە لە فەرمانبەرو هاوڵاتیو خزمەتگوزاری نێوانیان. (١)

شۆڕشی زانیارییەكان خۆی خزاندۆتە ناو كارو شێوازەكانی حكومەتەوە، چەمكی حكومەتی ئەلكترۆنی بریتییە لە پێشكەشكردنی خزمەگوزارییەكی زیاترو خێراتر، ئەویش لە ڕێگای بەكارهێنانی تەكنەلۆژیای زانیارییەكان بە شێوەی خزمەتگوزاری خۆیەتی، كە ئەمەش هەوڵ دەدات بە هەموو كەسێك لە ئەنجامدانی كارە حكومییەكانیان، هەروەها ڕێگا خۆش دەكات بۆ دەستەبەر كردنی خزمەتگوزارییەكان بە شێوەیەكی ئاسانو دروستكردنی متمانە، گرنگی بەكارهێنانی تەكنەلۆژیا لە لایەن حكومەتەوە دەگێڕێتەوە بۆ ئەو پێشكەوتنە بەرچاوەی كە هاتە ئاراوە لە پێشخستنی هەموو كارو چالاكییەكانی حكومەت، هەروەها گواستنەوەی زانیارییەكان لە شوێنێكەوە بۆ شوێنێكی تر بە خێراترین شێوە، هەروەها بە تیۆرێكی كەم، گواستنەوەی كارگێڕی حكومەت لە شێوازی سەرەتاییە بۆ شێوازی پێشكەوتوو، لە بەكارهێنانی تۆڕەكانو پۆستی ئەلكترۆنی، ئەمەش وا دەكات كارەكان لە ڕووی كارگێڕییەوە چالاكو خێراتر دەبێت، هەروەها ڕۆڵی حكومەت كاراتر دەكات بە كەمترین كاتو تێچوونو جێبەجێكردنی هەموو كارەكان.

كارگێڕی ئەلكترۆنی هاتۆتە كایەوە بە ئامانجی كارئاسان كردنی پرۆسە كارگێڕییە جیاوازەكان لە حكومەت، یاخود ڕێكخراوەكان بە خێراییەكی زۆرو تێچوونێكی كەم.

(السالمی) پێناسەی دەكات بەوەی بریتییە لە: ڕاپەراندنی كارەكان بەسوود وەرگرتن لە هەموو ئامرازەكانی گەیاندنی زانیارییەكان (كۆمپیتەرو ئینتەرنێت) بە مەبەستی گەیشتن بە كارگێڕییەكی سەركەوتوو، هەروەها كەمكردنەوەی بەكارهێنانی كاغەزو خێرا كردنی كردارەكانو لە ناوبردنی ڕۆتین، هەروەها بەستنەوەی هەموو بەشەكانی حكومەت بە یەكترییەوە.

هەندێك لە سوودەكانی ئەم شێوازەی كارگێڕی شكاندنی بەربەستی كاتو شوێنو پێشكەشكردنی خزمەتگوزارییەكی تایبەت بە هاوڵاتیان، ئەویش بە بەستنەوەی هۆكارەكانی گەیاندنی سەردەم بە چالاكیو بەرپرسیارێتیو كاری كارگێڕی حكومەتەوە.

هەروەها (نجم) پێناسەی دەكات بەوەی كارگێڕی ئەلكترۆنی بریتییە لە: ئەو سەرچاوە زانیاریانەی كە پشت دەبەستێت بە ئینتەرنێتو تۆڕەكانی گەیاندنی زانیارییەكان، هەروەها پێشكەشكردنی باشترینو خێراترین خزمەتگوزاری لە هاوڵاتیان بە خێراترین كاتو كەمترین تێچوون.(١)

١-٢ كارگێڕی ئەلكترۆنی (E – Government):

كارگێڕی ئەلكترۆنی بریتییە لە ئەنجامدانی پرۆسەكانی بە شێوەیەكی ئەلكترۆنی، هەروەها پێناسە دەكرێت بەوەی هەموو شێوازەكانی تەكنەلۆژیا بەكاردەهێنێت بە مەبەستی ئاسانكردنی كردارەكان لە ڕووی كارگێڕییەوە (IEE)، هەروەها بەستنەوەی حكومەت بە هاوڵاتییەوە (G2C) واتە: (حكومەت- هاوڵاتی) هەروەها لە ڕووی كارەوە (حكومەت - كار).

سەركەوتنی كارگێڕی ئەلكترۆنی پشت بە دوو تەوەرە دەبەستێت ئەوانیش:

تەوەرەی یەكەم: تا چەندە دەزگاكانی حكومەت ئامادەن لە ڕووی ئەلكترۆنییەوە، ئەویش بەدابینكردنی هەموو پێداویستییەكان بۆ دروستكردنی كارگێڕییەكی ئەلكترۆنی.

تەوەرەی دووەم: بڵاوكردنەوەی هۆشیاری تایبەت بە كارگێڕی ئەلكترۆنی، هەروەها چڕكردنەوەی چەمكەكانی تاوەكو بتوانرێت بە باشترین شێوە پراكتیزە بكرێت، گۆڕینی كۆمەڵگا بۆ كۆمەڵگایەكی ئەلكترۆنی.

ئامانجەكانی:

١- بەرزكردنەوەی كارو چالاكییەكان لەناو كەرتی حكومەتی (Internal Effectiveness and Efficiencies -IEE)، ئەویش لە ڕێگای ئاسانكردنی كارەكان بە كەمترین كاتو كەمترین خەرجی، هەروەها وردی لە ڕاپەراندنی كارەكان.

٢- كەمكردنەوەی خەرجی حكومەت، ئەویش لە ڕێگاكانی بەڕێوەبردنی كارەكان بە شێوەیەكی ئەندازەیی، هەروەها بەڕێوەچوونی كارەكان بە ئاسانی بێ ڕۆتین.

٣- ئاستی ڕازیبوونی خزمەتگوزارییەكان لە لایەن هاوڵاتیانەوە، ئەویش لە ڕێگای ئاسان بەكارهێنانی خزمەتگوزارییەكانی حكومەت، هەروەها پێشكەشكردنی زانیارییەكی وردو خێرا بە بەكارهێنەران كە لەگەڵ پێداویستییەكانیان بگونجێت.

٤-ئاسانكردنی ئاڵوگۆڕی بازرگانیو ئابووری، هەروەها ئاسانكردنی ئاڵوگۆڕی نێوان هەموو بەشەكانی حكومەت.

بە شێوەیەكی گشتی ئامانجی كارگێڕی ئەلكترۆنی گەیاندنی خزمەتگوزارییەكان، هەروەها دەرهێنانێتی لە جوگرافیایەكی بچووكەوە گەیاندنی بە زۆرترین كەس، هەروەها ئاسانكردنی كارەكانو گەیاندنی بە خێراترین كات و كەمترین تێچوون. (١)

(Footnotes)

(١) ڕازیقی

(TB) مەبەست ئەوەیە كە ئەو نەوەی كە لە دوای ئێمە دێن كارە كانیان هەمووی بە ئامێرە ئەلكترۆنییەكان بەڕێوە ببەن.

(1) http.//www.hrm-group.comvbshowthread.phpt=14719

(1) http.//www.arabtron.com/pageprint.php?id=7378

بەشی دووەمو کۆتایی

# پەیوەندی گشتی



**پەیوەندی گشتیو هونەری دانوستان:**

ئەو کەسەی لەگەڵ پەیوەندی گشتیدا سەرقاڵە، زۆرجار پەنا دەبات بۆ گرێبەستو دانوستاندن، یان بەشدارە لەگەڵ خاوەن بڕیارەکان لە دامەزراوەکەدا جا لەگەڵ خەڵکانی ناوخۆ، یان دەرەوەی ڕێکخراوەکەدا بن، یاخود لەگەڵ دەستەو دامەزراوە حکومییەکاندا بێت. یەکەم کار پێویستە بیزانێت شارەزایی بە هونەری دانوستاندن، پێویستە بزانێت چەندین جۆر دانوستاندن هەیە:

١- ڕێکەوتن لە بەرژوەندی هەردوو لایەندا: لایەنە ڕێکەوتووەکان پەنا دەبەنە بەربەرژوەندی هاوبەش لەم جۆرە ڕێکەوتنەدا، هەردوو لایەن یارمەتی یەکتر دەدەنو شێوازێکی داهێنەرانە پیادە دەکەن تا دەگەن بەڕێکەوتنێکی دیاریکراو لە بەرژوەندی هەردوو لایەندابێت، هەردوو لایەنی ڕێکەوتوو ستراتیژیەتێك بنیاد دەنێن کە لە پاشەڕۆژدا ببێتە هۆکاری قوڵبوونەوەی پەیوەندییەکانو پەلهاویشتنی بۆ بوارەکانی دیکەو قووڵبوونەوەی پەیوەندی دوولایەنە.

٢- ڕێکەوتن لە بەرژەوەندی لایەنێکو زەرەری لایەنێك: ئەم جۆرە ڕێکەوتنە کاتێك دروست دەبێت ناهاوسەنگییەك لە لایەنەکانی ڕێکەوتوودا هەست پێبکرێت، ئەمەش کاتێك ڕوو دەدات کە لایەنێك لە هەڵبژاردنی ئامانجەکانی ڕێکەوتنەکەدا بە باشی مەبەستەکانی دیاریکردبێتو لایەنی بەرامبەریش تەواو بە پێچەوانەوە. ئەم ڕێکەوتنە کاتێك دروست دەبێت ئامانجی ڕێکەوتنەکە بۆ قۆناغێك بێتو دوور بێت لە تێڕوانین بۆ داهاتوو. ستراتیژیەتی ئەمجۆرە دانوستاندنانە ململانێیە لەگەڵ لایەنی بەرامبەر بە مەبەستی تێکشکاندنو بە فیرۆدانی تواناکانیو پاشان ناشیرینکردنیو لە کۆتایدا دەستبەسەراگرتنی.

**پەیوەندی گشتیو گیانی ناخ (روح المعنويه):**

گیانی ناخ بە ئامانجێکی گرنگی پەیوەندی گشتی ناو دەبرێتو بە پێویست دەزانرێت بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی ڕێکخراوەکە، کەواتە پێویستە بزانین گیانی ناخ چییەو ئەو هۆکارانە چین کە کاریگەرییان هەیە بەسەر بەرزبوونەوەی ڕۆحی مەعنەوییەوە.

گیانی (مینوکی) ناخو کاریگەری لە بردنەوەی جەنگو کوشتارەکاندا کارێکە لە دێر زەمانەوە هەستی پێکراوە لە لایەن سەرکردە سەربازییەکانەوە. بەڵام پیاوانی بازرگانو پیشەسازی گرنگیان بەم لایەنە نەداوە تا ماوەیەکی کەم بەر لە ئێستا لە کاتێکدا گرنگی گیانی ناخیان زانیوە لە چۆنێتیو چەندایەتی بەرهەمهێناندا، ئەو کارەش لە بەجێهێشتنو بێزاری کرێکاران لە کارەکانیان گواستنەوەیان بۆ شولێکی کە دەردەکەوێت.

ئاوا پێناسەی گیانی ناخ دەکات: بریتییە لە توانای کۆمەڵێك Leighton ئەلکسەندەر لیتون: کەس دەردەکەوێت لە خۆگونجاندنیان بە پێداگریو لێبڕاوانە بە مەبەستی تەواوکردنی ئامانجێکی هاوبەش.

دەکرێت هاو واتای (روح المعنويه) گیانی کۆمەڵ بەکاربهێنین، وەك ئاماژەیەك بۆ باوەڕو پاڵپشتی کۆمەڵ، بوونی گیانی هاندانو یەکپارچەیی کۆمەڵو هەوڵدان بۆ تەواوکردنی ئامانجەکانی.

ئەوەی شایانی باسکردنە ئەوەیە لەبەرچاوگرتنی یاساکانی کۆمەڵ لە لایەن ئەندامانی کۆمەڵەوە هەمیشە ئاماژە نییە بۆ بەرزی گیانی ناخ. لەوانەیە لە ئەنجامی دیاریکردنی گشتی هێڵی کارو سزای توندەوە بێت، تەماشاکە ئەو شوێنی کارەی چرپەی تیا نابیسترێت، یان ئەو پۆلە ڕێکخراوەی بە تەواوی قوتابییەکانی گوێڕایەڵن، یاخود ئەو کارگەیەی بەرهەمهێنانی لە ئاستێکی باڵادایە، مەرج نییە لە ئەنجامی ڕۆحی مەعنەوی باڵاوە بێت گیانی ناخی باڵا ئەوەیە نەسەپێنرابێت.

**دیاردەکانی گیانی باڵا بریتین لە:**

١- ئارەزووی ئەندامانی کۆمەڵ (ئەو کۆمەڵەی لە شوێنێکی کارکردندا، یان... پێکەوەن) بۆ یارمەتیو یەکگرتن بە ویستی خۆیان دوور لە دەسەڵاتی دەرەکی.

٢- بوونی کەمترین ئەندازەی ناکۆکی لە نێوان کەسەکاندا.

٣- بوونی ئامانج گەلێکی هاوبەش کە هەمووان لە هەوڵی بەدیهێنانیدابنو .... هتد.

**ڕۆڵی کەسی پەیوەندی گشتی:**

ڕۆڵی کەسی پەیوەندی گشتی کورت نابێتەوە لە ناساندنی چالاکییە جیاوازەکانی دامەزراوەکە، بەڵکو درێژ دەبێتەوە بۆ وەرگرتنی زانیاری کە

لـە میانـەی ئـەو زانیارییانـەوە هەوڵی بەرەوپێشـبردنی دامەزراوەکـە دەدات، هـاوکات ڕۆڵـی زیاتـر دەردەکەوێـت لـە دابینکردنـی ئـارەزوو پێداویسـتییەکانی خەڵکانی ناوخۆو دروسـتکردنی وێنەیەکی ئەرێیانـەی ڕێکخراوەکـە لـە بەرچـاوی خەڵکانی دەرەکیدا.

ئامانج گەلێك کەسـی پەیوەندی گشتی کاری بـۆ دەکات: پێکدێـت لە ناسـاندنی دامەزراوەکـەو بەدەسـتهێنانی زانیـاریو پەیوەنـدیو ڕێکخسـتنو پلاندانـانو هەڵسەنگاندنو گونجاندن:

١- لێکۆڵینـەوەو کۆکردنەوەی زانیاری (کۆکردنـەوەی زانیـاری لەسـەر ئـەو کۆمپانیاو کڕیارو بەرهەمانەی کێبەرکێی دامەزراوەکەن).

٢- بوونـی پەیوەنـدی دوولایەنـە لە نێـوان خەڵکو دامەزراوەکەو دامەزراوەکەو خەڵکیدا. دانانی پلانی پەیوەندی گشـتیو جێبەجێکردنی (دانانی پلانی چارەسـەرو خۆپارێزەرانـە بە مەبەسـتی جوانکردنی شـێوەی دامەزراوەکـە بـە دانانـی پلانی کورتو ناوەندو درێژ مەودا).

٣- هەڵسـەنگاندن پیـاوی پەیوەنـدی گشـتی پێویسـتە پلانەکانـی کارکردنـی هەڵسـەنگێنێت بە شـێوەی قۆناغ، سەرەتا پێش دەسـپێکی کارو لە کاتی ئیشکردنداو پاش تەواوکردنی شول.

٤- دەزگای پەیوەندی گشتی بە ڕێکخەرێك دادەنرێـت لـە نێـوان بەڕێوەبەرایەتییـە جیاوازەکانـی دامەزراوەکەدا، هـاوکات بە ڕێکخەرێـك دادەنرێت لە نێوان دامەزراوەو لایەنگرەکانیدا.

**کارە سـەرەکییەکانی کەسی پەیوەندی گشتی:**

گەلێـك کاری سـەرەکی هەیە کەسـی پەیوەندی گشتی پێی هەڵدەستێت، لەوانە:

١- دروسـتکردنی پەیوەندییەکـی ئاسـایی لەگەڵ کۆمەڵانـی خەڵکدا، جا لە نـاوەو دەرەوەی دامەزراوەکەدا، یان لەگەڵ خەڵکیدا بەشێوەیەکی گشتی.

٢- پێدانی هەواڵی دەزگاو ڕێکخراوەکە بە ڕۆژنامەکان.

٣- دانانی سـتراتیژیەتێکی دیاریکراو بۆ ڕێکخراوەکە.

هەموو ئـەم کارانەش بـۆ بەرزکردنەوەی ڕۆحی مەعنەویو یەکڕیزی کرێکارانە لە ناوخۆی ڕێکخراوەکەداو پیشـاندانی وێنەیەکی گەشـی ڕێکخراوەکەیـە لە بـەردەم کۆمەڵانی خەڵکدا لە دەرەوەی ڕێکخراوەکە، سەرەڕای هەوڵدان بۆ بەردەوامی پێشخستنی ڕێکخراوەکە.

# تکایە لە کارەکەت بێزار مەبە!

عبدالمناف عبدالعزیز

هەریـەك لە ئێمە بـۆ بەدەسـتهێنانی پێداویستییەکانی ژیانمان، کارێکمان گرتۆتە ئەسـتۆ، ڕەنگە زۆرێك لە ئێمە بە هۆی ئەو ئەرکەوە هەسـت بە ماندوێتیو ئازار بکەین، لەوانەشـە هەر خـودی کارەکەمـان بە دڵ نەبێت، بە بڕوای من ئەوە شتێکی ئاساییە، چونکـە ئەو ئەرکە ڕۆژێـكو دوو ڕۆژ نییە، بەڵکـو ڕەنگە بـە کۆتایـی هێنانـی ژیانی کۆتایی پێبێت، بە هەرحاڵ ئەوە ڕاستییەکەو ئەرکێکە لەسەر شـانی هەریەك لە ئێمە کە پێویسـتە ئەنجامی بدەیـن، کەواتە لێرەدا گەر کارەکەشت بە دڵ نەبێت، یاخود ئازارت دەدات، تـۆ ناچـاری جێبەجێی بکەیت، واتە لێرەدا بڕیار لە دەستی تۆدا نییە، تاکە ڕێگەی تۆ ئەوەیە کە شێوازی کارکردنەکەت بگۆڕێت بە شێوەیەك کە حەزی پێ دەکەیت.

بە پێچەوانەوەشـەوە لەوانەیە هەریەکە لـە ئێمە لەگـەڵ ئەو کارە نـە گونجابین کە هەڵمانبـژاردووە، یاخـود ناتوانیـن توانـای خۆمان لـەم بوارە تاقیبکەینەوە، بە جۆرێکی تر حەز بە بوونی بوارێکی تر دەکەین، ئەوەش کارێکی ئاسـاییە، کەواتە گەر بەو شێوازەیت، پێویستە لەسەر تۆ ئەو کارانە ئەنجامبدەیت. کاتێك تـۆ لە هەریەکە لـە بوارەکانی ژیاندا کاردەکەیت، گەر هەسـت بە بێزاری دەکەیت، کە ڕەنگە هەریەکەمان هەسـتێکی جیاوازمان هەبێت، بەڵام لێرەدا گرنگ نییە هەسـتەکان جیاوازبێـت، گرنـگ ئەوەیـە کـە ئامانجی هەمووومـان دۆزینـەوەی ڕێگـە چارەیەکە بۆ ئەو کێشـەیە، لەوانەشە ڕێگەی هەریەکێکمان جیـاواز بێت لەوی تریان، بـە هۆی جیاوازی مرۆڤەکان لە هەڵسووکەوتیانەوە، یان شێوازی ژیانیانـەوە، بەڵام دووبارە لێرەدا ئەوە گرنگ نییە، مرۆڤ پێویسـتە لـەم کاتانەدا هێمنو ئارام بێت بیر لە سـەرچاوەی دروسـتبوونی بێزارییەکـەی بکاتـەوە، هەوڵبـدات بە هەر شـێوازێك بێت کارەکەی لا خۆشەویست بێت، گەرچـی کارەکەی قورسـیش بێـت، چونکە دڵنیام گەرمرۆڤ هەسـتی بـە ئارامی کرد لە کارەکەیدا هیچ کارێکی بەلاوە قورس نییە.

ڕەنگـە زۆرێکیـش لـە ئێمە بـاوەڕ بەو ڕاستییە نەکات، بەڵام دڵنیام کە دەربارەی چی دەدوێـم، چونکە بەم ئەزموونـەدا تێپەڕیوم، بـۆ نموونـە: (کاتێـك یەکێك لە سـکرتێرەی کۆمپانیایەکـی نەوت لـە ویلایەتی ئۆکلاهۆما کارێکی قورسی لە کۆمپانیاکە گرتبووە ئەستۆ، کە پێویست بوو گشت داواکاریی چاپکراوەکانی گرێبەسـتەکانی کۆمپانیاکە پڕبکاتەوە، گشـت ژمارەو ئامارەکانیش ئامادە بکات، کە ئەم کارە ترسو سامێکی زۆری لە ناخیدا دروست کردبوو. بـەڵام بڕیاری ئەو کچە چی بـوو؟ بڕیاری دا ئەو کارە بکاتە کارێکـی بزوێنەری زۆرخۆش، سـەرەتا کەوتـە ڕکەبەرایەتـی ڕۆژانە لەگەڵ پڕکردنەوەی فـۆرمو ئامادەکردنی ئامارەکانی ڕۆژانـە، لە کۆتایی ڕۆژەکەدا دەیژماردن، ڕۆژی دواتر هەوڵی دەدا ژمارەکە زیاتر بکات)..

ئاکامی ئەم کارە چی بوو؟ بووە خێراترین نووسـەری کۆمپانیاکە، پاداشـتی ئەو کچە لە بەرامبەر ئەو کارەدا چی بوو؟ ئایا پیاهەڵدانو ستایشـکردن بـوو؟ ئایـا بەرزکردنـەوەی ناونیشـانەکەی بوو؟ نەخێر هیـچ کامێکیان نەبوو، بەڵکو بەختەوەرو دڵشادی کچەکە بوو، چونکە ئامانجی سـەرەکی ئـەو بەختەوەری بـوو، نەك ماڵو دارایی، کە توانی خەسـڵەتی کارەکە بگۆڕێت لە ڕوانگەی خۆیەوە.

کەواتە لێرەدا گەرتۆش بێزاری لە کارەکەت هەموو هێـزو توانایەکی خۆت بخەرەگەڕ بۆ زاڵبوون بەسـەر ئـەو بێزاربوونەتدا، ئەگەر چیش لەوانەیە کارەکە لە سەرەتادا سەختبێت، بـەڵام پێویسـتە لەسـەر تـۆ بەردەوامبیت تاکـو ئامانجەکەت وەکو پێویسـت بپێکیت، هەرچەندە لەوانەیە هەندێکمان سەرکەوتوو نەبیـن لە چارەسـەرکردنی درووسـتبوونی بێزارییەکانمـان لە کارەکانمـان، بەڵام ئەوە مانای ئەوە نییە کە بەردەوام بین لەسەر ئەو کارەو خەمباریو خەمۆکی دامانگرێت، بەڵکو لـەم بارەدا وا پێویسـت دەکات کە شـێوازی کارکردنەکـەت بگۆڕیت بـۆ بوارێکی تر، بە پێی ئەو حەزەی کە لە ناخی خۆتدایە، بەڵام پێویسـتە لەسەرت دووبارە هەموو تواناکانت بەکاربێنیتو بەردەوام لە هەر هەڵەیەك کە لـە تەواوی ژیانتـدا ئەنجامتـداوە لە بیری خۆتی ببەیتـەوە، بەڵکـو وەك ڕکابەرایەتی بـەکاری بهێنەو سـوودی لێوەربگرە، هەموو ڕۆژەکان وا هەسـت بکـە کە ئەمـڕۆ یەکەم ڕۆژی دەست بەکاربوونتە لەو کارەدا.

# فەوزای کات لە ژیانی گەنجدا

و. بە دەستکاریەوە: ناصح خالید




کاتی بە هەدەردراو، هەلێکی بە هەدەردراوە، (دارایی)، یان (ڕۆشنبیری) بێت.

هەندێك لە ئێمە لە بە فیرۆدانی کاتەکانیدا زیاتر لە بەفیرۆدانی ماڵ و سامانیدا زیادەڕۆیی دەکات، لە کاتێکدا کات خۆی لە خۆیدا سامانو داراییە.

بە دڵنیاییەوە (کات) هەلە، هەلێکە بۆ پەرەپێدانی لایەنی ڕۆحی، هەلێکە بۆ بنیاتنانی کەسایەتی، هەلێکە بۆ فێربوون، هەلێکە بۆ مەعریفەت، هەلێکە بۆ وەدەستهێنانی دەستکەوتێکی ڕۆشنبیری، یان ماددی، هەلێکە بۆ خودناسینو یەکترناسین،

دەی کەواتە ئەم فەوزایە چییە لە بەڕێوەبردنی کاتەکانی ژیاندا؟

کاتێکی زۆر بۆ قسەو باسی بێسوود، بۆ جنێوی بازاڕی نێو گازینۆکان، بۆ دانیشتنی بێتامی بەردەم ئینتەرنێت، بۆ شەومانەوە تا درەنگانێك بە دیار زنجیرە هاوردەکراوەکان، کە هیچ جۆرە بۆنو بەرامەیەکی (ژیانسازیو مرۆڤدۆستی) پێوەنییە، بۆ وەستانی تاقەت پڕوکێنی سەر شۆستەو کۆڵانەکان، بۆ ڕۆچوون لە یارییە منداڵانە گەورە فریودەرەکانی (پلەی ستەیشن)، ئەمانەو سەدان (بۆ)ی تری (کات خۆرە).

ئەرێ بۆچی؟! چونکە تا ئێستا لە ئاهەنگێکی شایستەدا (کات)مان بە ڕەنگو دەنگو بەهاگرانی خۆی نەناسیوە، ئەو تێگەیشتنە تاعون ئاسایەمان بۆ دروستبووە کە تەنیا (حەزو ئارەزوو) بەڕێوەبەری گشتی (کات) بێت، ڕەفتارمان بۆ نەزیفکردنی (کات)ەکانمان ڕەفتاری ئەو کەسەیە کە بە دەستێك ئاوی کەڵلەتەزێن قیرە وشکو برینگەکەی بەر ماڵی دەشوات.

**(کات بێ نرخترین شتە لە بووندا، لە کاتێکدا تاکە شتە کە ناتوانین بیکڕین)!!**

ئەمە وتەی کەسێکە کە بەهای (کات)ی ناسیوە، هەر بۆیە زۆر جوان لە بارەیەوە دواوە، ئەمە وتەی داهێنەری کارەبا (ئەدیسۆن)ە.

دە وەرە با بەیەکەوە ئامارێك بۆ (کاتە بەهەدەردراوەکان) ئەنجامبدەین، ئەوجا دەزانین چ غەدرێکمان لە خۆمانو گەلو تەواوی مرۆڤایەتی کردووە.

سەرنج بدە ئەو دڵۆپە ئاوانەی کە لە بەلوعەیەکی خراپدا دەتکێت، ئایا دوای تێپەڕینی چەند کاتژمێرو ڕۆژێك عەمبارێکی گەورە پڕناکات؟

مەخابن چەندانو چەندین کاتژمێرو ڕۆژو هەفتەو مانگو ساڵ، لە ژینمان هەر لەگەڵ (با)دا دەڕوات، یاخود وەکو شتە بێکەڵکەکان هەر بە دەستی خۆمان خستومانەتە نێو زبڵدانەوە!!

دەزانی ڕەنگە بڕە کاتێك ڕامان (پڕۆژەیەك)، (کتێبێك)، (چارەسەری گرفتێك)، (دۆزینەوەی بیرۆکەیەك)، (بەرچاوڕۆشنییەك بۆ داهاتوو)، (ڕزگارکردنی ئایندەیەکی هەڕەشەلێکراو)ی لێبەرهەمبێت..

ئەو زانایەی کە چەند کاتێکی بۆ کارێکی زۆر گرنگی وەکو (ناسینی میکرۆبەکان) بەسەربردووە، دەڵێت:

**(ئەگەر تەنیا یەك خولەك لە ژیانمدا بەفیرۆ بدەم، وا هەست دەکەم کە تاوانێکم لە دژی مرۆڤایەتی ئەنجامداوە)**، ئەم قەناعەتەی (پاستۆر) لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کە ڕەنگە ئەم خولەکە خولەکی ڕزگارکردنی مرۆڤایەتی بێت بەهۆی داهێنکارییە ژیرییەکەی، لەو لاشەوە (ئەحمەد ئەمین)ی نوسەرو بیریاری میسری دەڵێت:

**(نرخی کات وەکو نرخی ماڵ و سامانە، هەردووکیان نرخەکەیان لە چاك خەرجکردن، یان باش بەکارهێنانیانە)!**

مەبەستی ئەو لە کات (زەمەنی چۆنییەتی)ە، نەك ژماردنی چرکەو کاتژمێرەکان، کات ماددەی خاوە بە دەستی مرۆڤەوە، وەکو (تەختەدار)ی بەر دەستی دارتاش، وەکو (ئاسن)ی بەردەستی ئاسنگەر، ئەو دەتوانێت بیانکات بە کەلوپەلێکی سودبەخشی مەبەستدار، دەشتوانێت سەقەتی بکات!

(بوسیسە)ی فەیلەسوف لە فەلسەفەی (کات بەکارهێنان)دا گەیشتووەو دەڵێت:

**(ئەو چەند کاتژمێرەی کە بە ئاگاو بێدارین لە قوتابخانە، تەواوی ڕۆژانی (بێکاری) ژیانمان لە کۆڵ دەکاتەوە).**

جا بۆ ئەوەی هەر یەکەو لای خۆمانەوە چارەیەك بۆ (فەوزای کات) دابنێین، ئەم نمونەیە وەبیر هەموو لایەك دەهێنمەوە:

من بڕێك پارەم لەبەردەستەو کۆمەڵێك پێداویستی، وەکو (خواردن، خواردنەوە، جلوبەرگ، کتێب، گەشتکردن، کەرەستەی جوانکاری)م، پێویستە، ئایا دروستە هەموو پارەکەم لەسەر مێزی نانخواردن دابنێم؟ یان هەمووی بۆ کڕینی جلوبەرگ تەرخان بکەم؟ یان خۆم لە هەموو خۆشییەکی ژیان بێبەش بکەمو تەنیا کتێب لەسەر ڕەفەکانی کتێبخانەکەم ڕیز بکەم؟

ئا لێرەدا حیکمەت لە عەقڵدایە، پێمدەڵێت: بۆ هەر پێویستییەك بڕێك پارە دابنێ.

کەواتە (کات) وەکو پارە وایە، پێداویستییەکانیش چاوەڕێی دەکەن!

سەرچاوە/ سایتی (البلاغ)

ئا: محەممەد مێرگەیی

# چۆن دەبیتە منداڵێکی هاوڕێی ژینگە؟

منداڵانی ئازیز، وەك ئاشکرایە ژینگە لە ژیانماندا گرنگی زۆری هەیە، بۆیە دەتوانین بڵێین ژینگەکەمان ئەو ژیانەمانە کە دەبێت پارێزگاری لێ بکەین، هەر یەکێك لە ئێمە ئەگەر بە چەند هەنگاوێکی تاکە کەسیو بچکووکیش دەست پێبکەین، ئەوا دەتوانین پارێزگاریی لە ژینگەکەمان بکەینو بیگۆڕین بۆ ژینگەیەکی تەندروستی وەها کە شایەنی ئێمە بێت، بۆیە ئێوەی منداڵانی ئازیز هەر یەکەو با لە خۆیەوە دەست پێبکاتو ڕەچاوی ئەم هەنگاوانەی خوارەوە بکات، تاوەکو ببێتە هاوڕێو دۆستی ژینگەو بیپارێزێت لە پیسبوون. ئەگەرچی هەندێك لەو هەنگاوو بیرۆکانەی کە لێرە باسکراون، لەوانەیە هێشتا لە وڵاتو کۆمەڵگەی ئێمەدا زۆر کاریان بۆ نەکرابێتو نامۆبن، بەڵام ئێوەی منداڵ دەتوانن هەر لە ئێستاوە گەشە بە وشیاریی ژینگەییتان بدەنو هەنگاوی بۆ بهاوێژن:

١- زیادەڕۆیی نەکردن لە بەکارهێنانی کاغەزدا: لە هەردوو دیوی کاغەز بنووسەو زێدەڕۆیی مەکە لە بەکارهێنانی کاغەزدا، چونکە بەکاربردنی بڕێکی زۆری کاغەزو دەفتەر، واتە بڕینی ملیۆنەها دارودرەخت، کە ئەمەش زیانی زۆر بە ژینگە دەگەیەنێت.

٢- جیاکردنەوەی زبڵو خۆڵەکان: لە وڵاتانی پێشکەوتوودا کاغەزو دەفتەرە بەکارهاتووەکان، شوشەکانو قوتووە ئەلەمنیۆمیو پلاستیکییەکان بەجیا لە شوێنی تایبەتی خۆیان دادەنرێن، تاوەکو لە دواییدا بنێردرێنە کارگەکانی دووبارە دروستکردنەوەیان.

٣- بەکارهێنانی ئامێری ژمێرەر کە بە وزەی خۆر کاردەکات: دروستکردنی پاترییەکان لە کارگەدا، ٥٠ کەڕەت زیاتر وزەی پێویستە لەو وزەیەی کە دەیبەخشێت، بۆیە ئەو ئامێری حاسیبەیە بەکاربهێنە کە بە وزەی خۆر کاردەکات. بەهەمان شێوە بۆ ئامێرەکانی تر.

٤- سەوزکردنی کتێبخانە: لە کتێبخانە بچکۆلەکەی ماڵەوەتدا، بەشێك تایبەت بکە بە کتێبو گۆڤاری تایبەت بە بابەتەکانی ژینگەیی.

٥- بە نووسینو تابلۆکێشان:

تەنها بە خوێندنەوەی کتێبو گۆڤارەکان، پەروەردەیەکی ژینگەیەکی وەدەست نایەت، بەڵکو بە بەشداری کاریگەرییانە لە گرنگیدان بە زەویو سروشتو ئاووهەواوە دەبێت. لە بارەی ئەم بابەتانەی ژینگەوە بنووسەو تابلۆی جۆراوجۆر بکێشە، بەشداربە لە گۆڤار، یان بڵاوکراوەکانی سەردیواری قوتابخانەکەت بۆ بڵاوکردنەوەی وشیاریی ژینگەیی.

٦- دژی جگەرەکێشان بووەستە: زۆرجار لە ئەنجامی هاوڕێیەتی قوتابخانەو زانکۆوە تووشی جگەرەکێشان هاتوون، چونکە هاوڕێ کاردەکەنە سەر یەکتری، تۆ دەتوانیت بەشداری بکەیت لە پاراستنی تەندروستی خۆتو کەسانی تر، ئەمەش بە کارکردنە سەر ئەوانەی کە ئارەزووی جگەرەکێشان دەکەن، بۆئەوەی وازی لێبهێننو لێی دووربکەونەوە، یاخود داوای مافی خۆت بکەیت لە هەڵمژینی هەوای پاکدا.

٧- دارودرەخت بچێنە: پێشنیار بکە بۆ قوتابیانی پۆلەکەت کە لە باخچەی قوتابخانەکەتاندا داربچێننو بایەخی پێبدەن، هەروەها بە هەمان شێوە دراوسێکانت هانبدە بۆ چاندنی دارودرەخت لە بەردەمی ماڵەکەیاندا.

٨- لە دەنگەدەنگو ژاوەژاو دووربکەوەرەوە: ژاوەژاو جۆرێکە لە جۆرەکانی پیسبوونی ژینگە، کە دەبێتە هۆی کزبوونی بیستنی مرۆڤ، لێکۆڵینەوە لە بارەی ئەو بابەتە بکەو لە پۆلو لەگەڵ کەسوکارو هاوسێکانتدا گفتوگۆی لە بارەوە بکە، هەوڵبدە کە لەگەڵیاندا ڕێککەون لەسەر نەهێشتنی هۆکارەکانی دروستکردنی دەنگەدەنگ، یاخود هەرنەبێت کەمکردنەوەی ژاوەژاو بە پێی توانا.

٩- ژینگەی قوتابخانەکەت بەسەربکەوەو پێشنیاری چارەسەر بکە:

لێکۆڵینەوەیەك لە بارەی زبڵو پاشماوەکانی قوتابخانەکەتو بڕی ئەو وزەو ئاوەی کە بەکاردەبرێت بکە، پێشنیاری چارەسەری گونجاو بکە بۆ دانانی سنوورێك بۆ پاشماوەکانو بە فیرۆدانی وزەو ئاو، بۆ جێبەجێکردنی ئەمەش لەگەڵ هاوڕێکانت چەند هەڵمەتێك ڕێکبخە.

١٠- هۆکارەکانی گواستنەوەی گشتی بەکاربهێنە: هانی هاوڕێکانت بدە بۆ هاتوچۆکردن بە هۆی هۆکارەکانی گواستنەوەی گشتی، چونکە ئەمانە کەمتر دەبنە هۆی پیسبوونی ژینگە، ئەمەش لەبەرئەوەی ژمارەیەکی زۆر نەفەر هەڵدەگرن کە گواستنەوەیان پێویستی بە دەیان ئۆتۆمبێلی تایبەت دەبێت.

سەرچاوە: سایتی اون اسلام نت

و: ئەمیر ئەحمەد عەبدولقادر




# پلاندانانی فێرکاریو پەیوەندیی به گەشەکردنی ئابوریی‌و کۆمەڵایەتییەوە

بێگومان پەیوەندییەکی تووندوتۆڵ لە نێوان پلاندانانی فێرکاریو گەشەکردندا هەیە، چونکە لە ڕاستیدا ئامێرێکە لە ئامێرەکانی، هەوڵێکی چالاکە بۆ ڕاگرتنی ئەو ئاراستانەی گەشەکردن کە ئەمڕۆ لە ئارادان، ڕێنمایی کردنیان بۆ بەدەستهێنانی ئەو ئامانجەی بەرژەوەندییە باڵاکانی کۆمەڵ بەدی دەهێنن، هەربۆیە زۆرێك لە پەروەرشکاران هەستاون بە پەیوەستکردنی پلاندانانی فێرکاری بە گەشەکردنی ئابوری‌و کۆمەڵایەتییەوەو هەماهەنگی لە نێوانیاندا، ئەوەش لە پێناو پەرەپێدانی چالاکی تاکو کۆمەڵدا، سوودوەرگرتن لە توانستە ڕەخساوەکان تا ئەوپەڕی توانا.

ئەو پەیوەندییە تەواوکارییە، کاتێك دەرکەوت کە وادانرابوو فێرکردن وەبەرهێنانێکی ئابورییە لە داهاتی مرۆییدا، ئەمەش دەکەوێتە بوارەکانی پلاندانانی گەشەکردنی ئابوری‌و کۆمەڵایەتییەوە، چونکە تێڕوانین بۆ فێرکردن وەکو فاکتەرێکی بەرهەمهێنان، لایەنێکە لە لایەنەکانی شوێن‌و پێگەی فێرکردن لە پرۆسەی ئابوریدا، هەروەها بەهاکەی وەکو فاکتەرێکی کارتێکردن لەسەر جۆرەکانی بە کاربردن ئاستەنگ بۆ گەشەکردنی ئابوری دروست دەکات.

لە وڵاتانی عەرەبی، هەروەکو وڵاتانی تریش، بیروڕایەکی بڵاوو بەهێز هەیە، کە فێرکردن دەروازەی بنەڕەتی گەشەکردنی ئابوری‌و کۆمەڵایەتییە، پەیوەندی نێوانیشیان زۆر کۆن‌و دێرینە، دەبینین (( ئادەم سمیث)) کە یەکێکە لە فەیلەسوفەکانی ئابوری لە سەدەی هەژدەهەم، دووپاتی کردووەتەوە کە ڕاهێنان‌و فێرکردن زۆر گرنگو بایەخدارە لە بەرزکردنەوەی توانای بەرهەمهێنانی کرێکار، زیاتر شارەزابوونی لە کارەکەی، هەروەها ئاماژەی بەوەش کردووە کە فێرکردن‌و پلاندانان بۆی زۆر گرنگە، بۆ سەقامگیربوونی سیاسی‌و کۆمەڵایەتی، بە مەرجێکی پێوویستی دەزانێت بۆ گەشەکردنی ئابوری.

پلاندانانی فێرکاری بە تەنها ئامانجی هێنانەدی پێداویستییەکانی گەشەکردنی ئابوری نییە، بەڵکو ئامانجی هێنانەدی پێداویستییەکانی گەشەکردنە بە تەواوی مانای گەشەکردنی ئابوری‌و کۆمەڵایەتی‌و ڕۆشنبیری، بە سەرجەم لایەنە جیاوازییە کانییەوە کە پەیوەستن بە پێشکەوتنی ئادەمیزادو گۆڕانی هەڵوێستەکانییەوە.

بێگومان پێشتر تێڕوانینێکی کۆن بووە لەسەر پرۆژەکانی گەشەسەندنی کۆمەڵایەتی، وا زانراوە کە پرۆژەی

بەکاربردننو ڕاستەوخۆ قازانجیان داهاتی ئابوری بەدەستناهێنن، بەڵام ئەم تێڕوانینە گۆڕانی بەسەردا هاتو ئێستاکە بە جۆرێك سەیری بەرنامەی گەشەکردنو خزمەتگوزاری کۆمەڵایەتی دەکرێت، کە سوودو قازانجی ئابوری هەیە، کە بە هۆی شارەزاییو پسپۆڕییەوە بە دەست دێت لە ئەنجامی فێرکردنەوە، ئەوەش کاریگەرە لە سەر بەرهەمهێنانو توانای کارکردنو درێژەدان پێی، لەم سۆنگەیەوە دەتوانین بڵێین گەشەسەندنی کۆمەڵایەتی بریتییە لە کۆمەڵێك بەرنامەی ئابوری، وەبەرهێنان تیایدا، درێژخایەنەو سوودو قازانجەکەشی مسۆگەرە.

زۆر لە مێژە ئابوریناسەکان پێداگری دەکەن لەسەر گرنگی ڕۆڵی فێرکردن لە گەشەکردنی ئابوریدا، شێوازەکانی بایەخدان لە نێوان بەرگری گشتی لە فێرکردن، بەو مانایەی گەورەترین هێزە لە پێکهێنانی کۆمەڵگایەکی ئارەزوومەندی پێشکەوتنو پێوەرەکانی ئابوری کە پاشماوەی فێرکردنو تێکڕایەکانییەتی.

بێگومان دەبێت بڵێین پلاندانانی فێرکردن، کاردەکاتە سەر گۆڕینی سەقامگیری سیاسیو کۆمەڵایەتی، سازکردنی بارودۆخێکی گونجاو بۆ گەشەکردنی ئابوری، سەرەڕای ئەوەش دەرفەتی زیاتر بۆ تاکەکان دەڕەخسێنێت لە فێرکردن، تاوەکو بەهرەو تواناکانیان دەربدەکەوێت. لەگەڵ ئەوەشدا تاکو ئێستا کەمێك دەربارەی ڕۆڵی پلاندانانی فێرکردن دەزانین لە پێشکەوتنی ئابوری کە لە قۆناغەکانی سەرەتایی گەشەسەندندایە، بەڵام هەندێ بەڵگەش لە ئارادان لە سەرئەوەی کە لە گرنگترین داخوازییەکانی گەیشتن بە ئابورییەکی بەهێزە.

چەند بابەتێکی بنەڕەتی لە بابەتی پلاندانانو گەشەکردندا هەیە، ئەگەر لە بیرو هۆشمان جێگیر بێت، ئەوا زۆر کۆششو کاتو دەمەقاڵێمان بۆ دەستەبەر دەکات، ئەو بابەتانەش بەڵگە نەویستن، بەڵام دەبێت بەباشی بیریان لێ بکرێتەوە، ئەوانەش بریتین لە:

**بابەتی یەکەم:**

مەبەست لە گەشەکردن لە هەموو بوارەکاندا -گەشەکردنی گشتگیرە نەك بە تەنها گەشەکردنی ئابوری-، لێرەدا پێوویستە جیاوازی بکرێت لە نێوان (گەشە)و (گەشەپێدان)، گەشەی ئابوریی بە تێڕوانینی توێژەر، ڕێگایەکە ئامانجی بەدیهێنانی وزەیە، ئەم وزەیە دەبێتە هۆی زیادبوونی ئابوریی لە ماوەیەکی دیاریکراودا، بەڵام گەشەپێدانی ئابوریی پرۆسەیەکە پێشکەوتنو دواکەوتنی ئابوریی نەتەوەیی دەخاتەوە، بە چەشنێك کاردەکات توانای بەرهەمهێنانی زیاتر بێت، بەمەش بەردەوام بەرهەمی تاك، یان کۆمەڵگا، بەرەو زیادبوون دەچێت.

بۆیە گەشەپێدانی ئابوریی گەشەی ئابوریی نییە، ئەم بابەتە پێویستە لە بیروهۆشی پلاندارێژەراندا بێتو بەتایبەتیش پەروەرشکاران.

**بابەتی دووەم:**

ئەمەش بابەتێکە پێویستە پلاندانانی فێرکردن لەمەوە سەرچاوە بگرێت، ئەویش ئەو پەروەردەیە کە دەتوانێت کار بکاتە سەر گەشەپێدان لە سەرجەم لایەنەکانییەوە نەك هەر چەشنێك بێت لە پەروەردە، هەندێ جۆری پەروەردە هەیە دەبێتە هۆی پێچەوانەی ئامانجەکانی گەشەپێدان، ئەگەر ئامانجەکانی گەشەپێدان دانەنرێت تیایدا، بۆ ئەمەش بەڵگەو نیشانەی زۆر هەیە کە دیارترینیان بوونی ژمارەیەکی زۆر بێکارییە لە ناوچینی ڕۆشنبیران، بە تایبەتیش بێکاری ڕۆشنبیران لە وڵاتانی تازە گەشەکردو زۆر پەرەی سەندووە، بۆیە هەر پەروەردەیەك نابێتە هۆی گەشەپێدان، پێویستە ئەو شتە خوازراوانە لەناو پەروەردە دابنرێت کە دەبنە هۆی گەشەپێدان، کەواتە بێگومان دەبێت پلاندانانی فێرکاری هەبێت، چونکە لە کۆتاییدا هەر ئەو ڕێکخەرو هۆکارو ئامێرە، کە هەوڵ دەدات ئەوەی لە توانایدایە ئەنجامی بدات، وابکات پەروەردە بە شێوەیەکی کرداری لە خزمەت گەشەپێدانی گشتگیردا بێت بە هەموو ڕەهەندەکانییەوە، هەروەها لە خزمەت پێداویستییەکانی هێزی کاردابێت لە لایەکەوە، گەشەپێدانی ئابورییو کۆمەڵایەتیش لە لایەکی دیکەوە.

**بابەتی سێیەم:**

ئەمەش پەیوەندییە لە نێوان فێرکردنو هۆکارەکانی تری کۆمەڵایەتیو ئابوری کە پەیوەندییەکی بازنەییە، زۆرێك لە پەروەرشکاران پێیان وایە پەیوەندییەکە هێڵییە، نە پەروەردە بە تەنها گرفتی ئەو بارودۆخە ئابوریو کۆمەڵایەتییە، نە ئەو هۆکارانەش گرفتی پەروەردەن، بەڵکو لە نێوانیاندا وەرگرتنو پێدان هەیە.

پلاندانانی ساغو تەواو دەزانێت ئەم پەیوەندییە لە نێوان وەرگرتنو پێدانو باشترین شێواز لێ دەردەهێنێ بۆ هەڵسانەوەی کۆمەڵگاو تاك هەڵسانەوەیەکی ڕێكو پێك، نەك هەڵسانەوەی بە ململانێ، بۆیە بێگومان پێویستە پلاندانان بازنەیی بێت.

**بابەتی چوارەم:**

گرنگترین شت لە پلاندانان شتە سەرەکیو یەکەمەکانە، مەبەست لە سەرەکییەکان پێشخستنی پسپۆرییەك، یان قۆناغێکی فێرکارییە بەسەر یەکێکی تردا لە خەرجکردنو پشتیوانی کردنو بایەخپێدان، کێشەی شتە سەرەکییەکان پێویستە لە دوو ڕەهەندەوە بۆی بڕوانین:

ڕەهەندی یەکەم: پلەی گەشە، یان پێشکەوتن لە قۆناغەکانو چەشنە جیاوازەکان لە فێرکردندا.

ڕەهەندی دووەم: مەودای پێوویستی لە فراوانکردن لە قۆناغەکانو چەشنە جیاوازەکان لە فێرکردن بۆ هێنانەدی ئامانجەکانی گەشەپێدانی ئابوریو کۆمەڵایەتی.

هەر توێژینەوەیەك لەسەر بنەما سەرەکییەکانی فێرکردن، پێوویستە لە چوارچێوەیەکی گشتگیری نەخشەو پلانەکانی گەشەپێدانی ئابوریو کۆمەڵایەتیدا بێتو پێداویستییەکانی کەرتە جیاوازەکان لە بەرچاو بگرێت، بە شێوەیەکی ئەو تۆ جێبەجێکردنی پلانی فێرکاری ببێتە هۆی هێنانەدی هاوسەنگییەك لە گەشەپێدانی ئابوریو کۆمەڵایەتی، بۆیە هەر پلاندانانێك بۆ فێرکردن لە سەر بنەمای دروشمی سیاسی دیاریکراو بنیات بنرێت، بێئەوەی مەسەلە ئابورییەکانی لەبەرچاو بگرێت، یاخود پشت بە شێوازە بابەتییەکان نەبەستێت، بێگومان دەرئەنجامی ئابوریو کۆمەڵایەتی ترسناکی لێ دەکەوێتەوە.

ئامادەکردنی: محمد علي القضاة.

و: وەهاب حەسیب

# پێناسەی ململانێی ڕێکخراوەیی



## واتای ململانێی ڕێکخراوەی:

یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی سەدەی بیستو یەکەمو تاڕادەیەکی زۆر سەدەی ڕابردوو، ململانێی نێوان ڕێکخراوەکان بوو بە شێوەیەك هەریەکێکیان دەیویست لەو بوارەدا پشکی شێری بەربکەوێتو هەریەك ڕێگاو شێوازێکی گرتبووەبەر، ئەمەش دۆخێکی هێنابووە ئاراوە کە ململانێکە بگاتە ڕادەیەك، هەندێکیان لە ڕێگای یەکگرتنەوە چۆك بە ڕکابەرەکانیان دادەنو بڕێکیان هەڵوەشان.

لەم نێوەندەشدا هەندێ لە ڕێکخراوە بەرهەمهێنەکان بە مەبەستی مانەوەیان لە گۆڕەپانەکەدا پەنایان بردووەتە بەر لەبەرگرتنەوەی کاڵاو شمەکەکانی ڕکابەرەکانیان، وەك کۆمپانیاکانی وڵاتانی چین، تایوان، تایلەند پەیڕەویان دەکرد، (لە ڕووی یاساییەوە کارێکی نایاساییەو یاساغە) لە ناوخۆی ڕێکخراوەکانیشدا بە هەردوو دیویدا (باشو خراپ) کاریگەرییەکەی هەست پێدەکرێت بە هۆی جیاوازی لە سروشتی مرۆڤەکانو ئامانجە جۆراوجۆرەکانی ڕێکخراوەکاندا.

## پێناسەی ململانێی ڕێکخراوەی:

زۆرانبازی ڕێکخراوەیی پێناسە دەکرێت: بەوەی جۆرێکە لە تێکەڵاوی کۆمەڵایەتی لە کاتی پێکدادانی بەرژوەندییەکانی تاكو کۆمەڵدا دروست دەبێت، هەڵوێستێکی کێبەرکێکارانەیە، هەموو کێبەرکارێك دەزانێت بەرانبەرەکەی کێیەو چی دەکات، هیچ شێوازێك نییە بۆ گونجاندن لە نێوان بەرژوەندییو بەرژەوەندیی بەرانبەرەکەیدا، کێبەرکێکەی نێوانیان دەگۆڕێت بۆ زۆرانبازی، هەرلایەنێك هەوڵدەدات بەرانبەرەکەی تێکبشکێنێتو بەسەریدا زاڵبێت.

هەروەها پێناسەکراوە: کە تێکۆشانێکە لە دەوری بەهاکانی ڕێکخراوەییو هەوڵدانە بۆ بەدەستهێنانی شوێنو هێز، بریتییە لە تێکۆشانێك بە مەبەستی بە دەستهێنانی سەرچاوەی دیاریکراوو دەگمەن، بە شێوەیەك کێبەرکێکارەکان هەوڵدەدەن دەستبەسەر دوژمنەکانیاندا بگرن.

ناکۆکی ڕێکخراوەیی بە شێوەیەك ئاماژەی بۆ دەکرێت کە گۆڕان، یان تێکچوونێکە بەسەر ڕەوشتی باودا دێت، دەبێتە هۆی پەککەوتن، یاخود داڕوخانی ئامرازەکانی بڕیاردان.

لەبەرئەوە ناکۆکی بە هەڕەشە، یان تەواوکارییەك ئەژمار دەکرێت، کە وێنەو شێوەی جیاوازی نەیار لە خۆ دەگرێت، دەتوانین بڵێین کە ململانێ ناکۆکییەکی ڕاستەوخۆو بە مەبەستی نێوان تاکەکان، یاخود کۆمەڵەکانە لە پێناو ئامانجێکداو بەزاندنی لایەنی ڕکابەر بە مەرجێکی سەرەکی دادەنرێت بۆ گەیشتن بەو ئامانجە، لە ڕوانگەی پەیوەندی کارگێڕییەوە ناکۆکی ڕێکخراوەیی ناسێندراوە بەوەی بە کوشتن ئاماژەی بۆ دەکرێت لە نێوان دوولایەندا کە پەیوەندی نێوانیان لەسەر بنەمای پشت پێبەستن دروست دەبێتو کاتێك دەگەنە ئەو باوەڕەی کە سەرچاوەکانیان دیاریکراوو ئامانجەکانیان دژ بە یەکەو هەرلایەنێك لە کاروباری ئەوی دیکەدا لە کاتی تەواوکردنی ئامانجەکانیدا دەست وەردەدات. ناکۆکی بە واتایەکی پێشکەوتووانە مانای کێبەرکێ Competition ناگەیەنێت، کێبەرکێ زۆربەی کات تێڕوانینێکی دوژمنکارانەی تیادا بەدیناکرێت کە زیان بە کەس، یان لایەنەکانی تر بگەیەنێت.

لەبەرئەوە کێبەرکێ کارێکی کۆمەڵایەتییە، لە بەریەك نەکەوتنی لایەنەکاندا دەردەکەوێت، پاشان بریتییە لە تێکەڵاوییەکی ڕێکخراو تێکۆشان لە پێناو ئامانجێك، یان ئامانج گەلێکدا لە خۆدەگرێت، دەگونجێت کێبەرکێ بە شێوەی ڕاستەوخۆ، یان ناڕاستەوخۆ بێت، یاخود لەسەرئاستی کەسێتی، یان ناکەسێتی بێت بە هەرحاڵ کێبەڕکێ هەر شێوازێك لە خۆ بگرێت، دوورە لە توندوتیژیو بەکارهێنانی هێز.

## گرنگترین هۆکارەکانی ناکۆکی:

١- بوونی ناکۆکیو پێکدادانو نەگونجاندن لە سروشتی ئەو چالاکییانەی کە تاکەکان پێیهەڵدەستن، کێبەرکێ لەسەر پۆستێك، یاخود سەرچاوەیەکی کەمو دیاریکراو دەبێت، ئەمەش کاتێك ڕوودەدات لایەنە ناکۆکەکان نەتوانن لەسەر هەرچارەسەرێك بگەنە ئەنجام.

٢- هەندێجار ناکۆکی دروست دەبێت لەسەر جیاوازی لە سروشتی کەسەکانو ئاستی ڕۆشنبیرییو تەمەنو بەهاو باوەڕکانو... .

٣- ناکۆکی بە هۆی ناڕوونی لە ڕۆڵی کارکردنو دیاری نەکردنی دەسەڵاتو بەرپرسیارێتی بە شێوەیەکی ورد، دروست دەبێت، یاخود بە هۆی سروشتی شەڕەنگێزیو نەبوونی گیانی هاوکاری لای هەندێك کەسەکان.

ململانێی ڕێکخراوەیی کارێکی بەڵگە نەویستەو بە یەکێك لە توخمەکانی لایەنی جوڵاو لە ڕەوشتی کۆمەڵدا دێتە ئەژمار، بە مەبەستی ئەوەی کۆمەڵەکان لایەنێکی تایبەتمەند لە خۆبگرن، پێویستە ئاستێکی باش لە تێکەڵاویو یەکگرتنو ململانێو وەلاخستنو... تیایاندا بە دیبکرێت. دەتوانیین بڵێین کە ململانێی ڕێکخراوەیی لایەنی باشو خراپ لە خۆدەگرێت، کە بریتین لە:

## لایەنەباشەکانی ڕەنگدەداتەوە لە:

١- ململانێی ڕێکخراوەیی یارمەتیدەری تواناو ئامادەباشییەکانی کارکەرانە کە لە کاتی دۆخی ئاساییدا دەرناکەون.

٢- هەندێجار ململانێ، گۆڕانکاری بەدوادا دێت، یارمەتیدەری بەڕێوەبردنە بۆ دۆزینەوەی ڕێگای چارەسەر، بۆ ململانێکە.

٣- ململانێ یارمەتیدەرە بۆ تێربوونی دەروونی، بە تایبەت لای ئەو کەسانەی کە خاوەن ئارەزوویەکی شەڕەنگێزن.

٤- لەوانەیە ململانێ ببێتە هۆی دەستنیشانکردنی هەندێ زانیاریو ڕاستی لە دەستنیشانکردنی هەندێ ئاریشەی ڕاستەقینە لە کەشی کاردا.

٥- دۆزینەوەی ڕێگاچارەی ململانێ لە نێوان دوو یەکەی کار، یان زیاتر لە یەکەکانی ڕێکخستن، لەوانەیە ببێتە هۆی دووبارە هاوکاریو ڕێکخستن، زیاد لەوەی کە پێشتر لە نێوانیاندا هەبووە.

**هەرچی لایەنە خراپەکانییەتی بریتین لە:**

١- لەوانەیە لایەنێك لە لایەنە ناکۆکەکان، زیادەڕەوی بکات لە بەرژەوەندییەکانیدا لەسەرحسابی بەرژەوەندی هەموو ڕێکخستنەکە.

٢- لەوانەیە ببێتە هۆی فریودانی کاتو کۆششو دراو، لە کۆتاییدا هۆکاری لاوازی ئاستی کاراو ئەوەندەی بەشبکات (لە کاتو کۆششو تێچوون)، لێبکەوێتەوە.

٣- لە ململانێدا نەمانی باوەڕ لە نێوان کرێکارانوبەڕێوبەرایەتیدادروستدەبێتوهەندێ لە کرێکاران پەنا دەبەنە بەرکاری دوژمنکارانەی وەك پەکخستنی ئامێرو ئامرازەکانو شاردنەوەی زانیاریو هاوکارینەکردنی بەڕێوەبەرایەتیو بڵاوکردنەوەی زانیاری چەواشەکارانە لە بارەی بەڕێوەبەرەکانیانەوە، لە وانەیە ململانێکە بگۆڕێت لە بازنەی ڕێکخستنەوە بۆ زۆرانبازی کەسێتیو بەشێوەیەکی خراپ کاریگەری بە سەر سروشتی هەڵسوکەتەوە جێبهێڵێت لە داهاتوودا.

لە توانای بەڕێوبەرایەتیدایە دەست بەسەر ململانێکەدا بگرێت، یان چارەسەری بکات، یاخود کەمی بکاتەوە بەگرتنەبەری ئەم ڕێگاو شێوازانە.

٤- ڕوونکردنەوەی ئامانجە گشتییەکانی ڕێکخراوەکە، پێویستە هەموو بەشو بازنەیەك لە ناوڕێکخستنەکەدا ئامانجە گشتییەکان لەبەرای ئامانجەکانی بێت کاتێك لەگەڵ ئامانجە لاوەکییەکاندا پێکدا دەدەن.

٥- دیاریکردنی ڕۆڵوچاکسازیوبەرپرسیارێتی هەموو کارێك بە شێوەیەکی ئاشکراو دیار، دۆزینەوەی جۆرێك لە تەواوکاری ڕێکخستن لە ڕێگەی دروستکردنی لیژنەی ڕێکخستن بە شێوەیەك هەموو لایەنە پەیوەندیدارەکانو ئەرکە پێکداچووەکان بگرێتە خۆ.

٦- دەست تێوەردانی ڕاستەوخۆو خۆڕاگرانەی بەڕێوەبەر لە کاتی ڕوودانی ململانێداو کۆتایهێنان بە ناکۆکییەکان، پەیوەستکردنی کرێکاران بە فەرمانەکانی بەڕێوەبەرو ڕێزگرتنی بڕیارو ڕێنماییەکانیو جێبەجێکردنیان لە ژێر سزا گەلێکدا، هەروەها لە توانای بەڕێوەبەردایە سەرپێچیکارانو کەسانی شەڕەنگێز سزابدات، بەراگرتن، یاخود دواخستنی زیادەی ساڵانەیان، تەنانەت گواستنەوەو دەرکردنیان بە یەکجاری.

لە کۆتاییدا ئەگەر ململانێکە پەیوەست بوو بە بەشەکانو بەڕێوەبەرایەتییەکانەوە، دەتوانرێت پەنا ببرێت بۆ لایەنی پەیوەندار بە هیوای چارەسەری کێشەکەو ئاگاردارکردنەوەی لایەنە ناکۆکەکان لە بەردەوامی دووبارەبوونەوەی ئاریشەکەو گەیشتنیان بە چارەسەر (چارەسەرێکی مامناوەندییانە)، لەم دۆخەدا هەر لایەنێکی ناکۆك سوودی خۆی تیادا دەبینێتەوەو لەوانەیە ئەوچارەسەرە کەمترین دەستکەوتی ئەو لایەنە بێت کە هەوڵی بەدەستهێنانی داوە.



# سەلیقەی کارتێکردن

زانا سەعید هەورامی

هەرکە (سایمۆن کوپەر) لە ساڵی ٢٠٠١دا، پۆستی سەرۆکی کۆمپانیای میوانخانەکانی (ڕیتز کارڵتۆن)ی گرتەدەست، ڕووبەڕووی ململانێیەکی بێوێنە بووەوە، بە چەشنێك دەبوو یەکێك لە هێما بەناوبانگە بازرگانییەکان لە جیهاندا، بە ئاستێکی نوێی ناوازەیی بگەیەنێت، چونکە کۆمپانیاکە سەرکەوتوو بوو، کارمەندەکانی بەختەوەرو کڕیارو بەشداربووەکانی ڕەزامەندنو خاسێتیش هەمەلایەنەیە. ئیدی دەبێت ئەم کۆمپانیایە، چی بۆ (کوپەر) هێشتبێتەوە، تا بیخاتە سەر خەرمانی دەسکەوتە باشەکانی، هەڵبەت لە پاش ئەوەی جێگەی (هۆرێست شۆڵتەرز)ی گرتەوە، کە بۆ بیست ساڵی ڕەبەق، ناوی کۆمپانیاکەی بە لووتکە گەیاند.

(کوپەر) هەروەك سەرکردە جێدەست دیارەکان، نەیدەویست؛ جێ هەنگاوەکانی کەسانی پێش خۆی هەڵبگرێتەوە، لەبەرئەوە بڕیاری دا: میوانخانەکانی (ڕیتز کارڵتۆن) بە ڕووبەروو ئاسۆیەکی فراوانتر بگەیەنێت، تا کار لە دڵو دەروونو هزروهۆشی میوانو کڕیارەکانی بکاتو یادگارییەکیان بۆ بهێڵێتەوە، کە هەرگیز لە یادیان نەچێت، کەواتە چۆن ئەم کارەی بۆ دەست دەدات؟!

(کوپەر) دەستی بە تۆژینەوەی خواستی میوانەکانی کرد، سەرنجی دا، ئەوەی میوانەکان دەیانەوێت، بریتییە لە: ژووری دلگیر، خواردنی بەچێژ، کافیتریای تەندروست، بەڵام لە کاتێکدا دەتوانن ئەم خواستانەیان لە جێگەیەکی دیکەدا، بە نیوەی ئەو نرخە دەست بکەوێت، دەی بۆچی بە هەمیشە میوانی میوانخانەکانی (ڕیتز کارڵتۆن) دەمێننەوە؟!

(کوپەر) ئەنجامی تۆژینەوەکانی پوخت کردەوەو بەو ئاکامە گەیشت کە: لە ٩٠٪ی وابەستەیی کڕیارەکان بە کۆمپانیاکەوە، بۆ لایەنی سۆزو دڵڕاگرتن دەگەڕێتەوە، تەنها لە١٠٪ی بۆ لایەنی پارەوپوڵ دەگەڕێتەوە.

کەواتە سەرباری گرانی زۆر لە نرخدا، ئەوەی وای لە میوانەکان کردووە، دیسانەوە بۆ میوانخانەکانی کۆمپانیاکە بگەڕێنەوە، ئەو بەدەمەوەچوونو گرنگیدانەی کارمەندەکانە، کە پێشکەش بە میوانەکانی دەکەن!

(کوپەر) لێرەدا، دەستیکرد بەوەی کاریگەری لەسەر کارمەندەکانی دروست بکاتو هانیان بداتو دڵیان لەسەر ئەوە دابمەزرێنێت کە ئەگەر لە هەر جارێکدا بە خۆشەویستیو کارزانیو زیرەکییەوە، نەجووڵێنەوەو بە ئاکاری جوانیان، گیان بە بەر هێمای کۆمپانیادا نەکەنەوە، ئەوا هێمای کۆمپانیا، نیشانەیەکی بێهەستوخواستە!

هەڵبەت (کوپەر) لە کارمەندەکانی نەدەپرسی: میوانەکان، دەیانەوێت چی بکرێ؟ بەڵکو پرسێکی ناباوی لێ دەپرسین: پێم بڵێن.. ئەو شتەی میوانەکان بۆیان ناکرێت چییە؟! هەر خۆی وەڵامەکەی بەم چەشنە دەدانەوە: میوانەکان.. خزمەتکردن لە کانگەی دڵەوە، بزەی سەرلێو، خۆشەویستی، دەستو دڵپاکییان، بۆ ناکرێت. پاشان دەیگوت: ئەمەش ئەو شتەیە کە دەبێت خۆتانی پێ بخەملێنن و بنەخشێنن، تا بە درێژایی ژینیان، ببن بە هەمیشەمیوانی میوانخانەکانی کۆمپانیا!

(کوپەر) سەرنجێك سەبارەت بە ئەزموونە سەرکەوتووەکەی خۆی لە بەڕێوەبردنی کۆمپانیاکە دەداتو دەڵێت: (گەر لە میوانێك بپرسین: ڕەنگی ڕاخەری ئەو ژوورەی تێیدا ماویتەوە، چی بوو؟ ئەوا بەلایەنی زۆرەوە، لە یادیدا نەماوە.. بەس پاش ئەوەی لە میوانخانەکەدا ماوەتەوە، ئەگەر سەبارەت بەو یادگارییەی هەرگیز لە یادی دەرناچێت، لێی بپرسین.. ئەوا یەکسەر لە وەڵامدا دەڵێت: ئەو بایەخدانو دڵڕاگرتنە دروستەی کارمەندەکان، لە بەرامبەر میوانەکان، ئەنجامیان داوە.. هەرگیز لەیادم دەرناچێت!)

سەرچاوە/ خلاصات: ٣٨٩

بەرزان ئەبوبەکر



# هەستکردن بە بەرپرسیارێتی!

جارێکیان پادشای وڵاتێك فەرمانی بە پاسەوانەکانی کرد، بەردێکی تا ئەندازەیەك گەورەو قورس لەسەر شەقامی سەرەکی شار دابنێن، پاشان فەرمانی بە دووان لە پاسەوانەکان کرد، لە دوورەوە چاودێری بەردەکە بکەن، بۆئەوەی بزانن تا چەند هاوڵاتیان هەست بە بەرپرسیارێتی دەکەنو گرفتو بەربەستەکانی شارەکەیان بە گرفتی خۆیان دەزانن، تا بزانن کێ ئامادەیە تەنها کەمێك لە کاتی خۆی دەگرێت، بۆ لابردنی ئەو بەردەی کە بووەتە دروستکردنی نارەحەتی بۆ خەڵکی شارەکە...

بەردەکە دانراو پاسەوانەکانیش لە دوورەوە چاودێریان دەکرد، هەر کەس لەوێوە تێدەپەڕی، خۆی لادەداو ئامادە نەبوو بەردەکە لەسەر ڕێگەکە لاببات، کات لە نیوەڕۆ نزیك بووەوە، بەڵام بەردەکە هەر لە شوێنی خۆی بوو، تەنانەت هیچ کەس بەردەکەی تاقی نەکردەوە، ئاخۆ دەتوانێت بەردەکە لەسەر ڕێگەکە لاببات، یان نا؟

کەس بە گرفتی سەرەکی خۆی نەدەزانی، هەر کە دەگەیشتنە ئاستی بەردەکە، ڕێڕەوی خۆیان دەگۆڕیو بە لایدا تێدەپەڕین، هیچ کەس ئامادەنەبوو کەمێك لە کاتی خۆی بگرێتو بەردەکە لەسەر شەقامی سەرەکی لاببات، چاودێری بەم شێوەیە بەردەوام بوو، زۆری نەمابوو خۆر ماڵئاوایی بکات، کات درەنگ بوو، بەردەکەش هەر لەسەر شەقام بوو.

درەنگانێك پیاوێك بەدەرکەوت، کاتێك گەیشتە ئاستی بەردەکە، کەمێك لە بەردەکە ڕاماو سەیرێکی ئەملاو لای خۆی کرد، کەسی بەدی نەکرد، چونکە کات دەمەو ئێوارەیەکی زۆر درەنگ بوو، پاشان قۆڵی هەڵماڵیو بە هەموو هێزی پاڵی نا بە بەردەکەوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە بەردەکە زۆر قورس بوو، بەڵام هەر کۆڵی نەدا، بەردەوام بوو تا سەرەنجام توانی بەردەکە لەسەر شەقام دوور بخاتەوەو ڕێگەکە بە تەواوی بکاتەوە.

دوای ماندوو بوونێکی زۆر، پشتی بەرز کردەوەو هەناسەیەکی هەڵکێشا، سەیرێکی ئەو شوێنەی کرد کە بەردەکەی لێ بوو، لە ناکاو زۆر سەری سوڕما، دەزانن بۆ؟

چونکە لە ژێر بەردەکەدا چاڵێکی بچووك هەڵکەنرابوو، پارچەیەك زێڕی گرانبەهاو نامەیەکی تێدا بوو، کاتێك پارچە زێڕەکەو نامەکەی هەڵگرت، بینی لە نامەکەدا نووسراوە، ئەم پارچە زێڕە دیاری جەنابی پاشای وڵاتە، بۆ ئەو کەسەی ئەم بەردە لا دەبات.

لێرەوە فێردەبین کە هەستکردن بە بەرپرسیارێتیو گرنگیدان بە خەمی خەڵكو لابردنی ئاستەنگەکانی سەر ڕێگەیان، تەنها خەڵکی سوودمەند نابن، بەڵکو سوودمەندی یەکەم کەسەکە خۆیەتی، مەرج نییە هەموو کات لە لابردنی بەربەستی سەر ڕێگەکانو دەستگیرۆیی هەژارانو بێنەوایان، قازانجی ماددی بەدەستبهێنین، ئاسوودەیی ویژدانو ئارامی ڕۆح، زۆرگەورەترە لە خەڵاتە ماددییەکان، بێگومان ئەم خەڵاتەش بە یارمەتیدانو هاوکاریو گرنگیدان بە چارەسەرکردنی خەمەکانی دەورووبەرو دۆستانو ئەزیزانت بە دەست دێت.

زۆرجار دەبیستین هاوڵاتیان، بە تایبەت ئەوانەی لە هەندەران دەگەڕێنەوە، باس لە پاکوخاوێنیو جوانی شەقامەکانی وڵاتانی پێشکەوتوو دەکەن، ئەوەی جێگەی هەڵوێستە لەسەرکردنە ئەوەیە کە پاکراگرتنی شەقامو کووچەو کۆڵانەکان دەبێت لە ئەستۆی کێ بێت؟

ئایا بە تەنها حکومەت لەو کارە بەرپرسیارە؟

بێگومان نەخێر! ئێمە دەمانەوێت شەقامەکانمان پاکوخاوێن بن، بەڵام ئامادە نین بەردێك، کاغەزێك،... لەسەر شەقام هەڵگرینەوە، سەیرتر لەوەش ئەوەیە لە جامی ئۆتۆمبێلە ئاخر مۆدێلەکانەوە قوتوی ساردیو بتڵی ئاوو... هتد، فڕێ دەدرێتە سەرشەقامەکان!!

گەر هەمووان گرفتو کێشەکانی کۆمەڵگەکەمان بە گرفتی سەرەکی خۆمان بزانینو پێکەوە هەوڵی لابردنی بەربەستەکان بدەین.. ئەو کاتە دەبینە کەسێکی بە ویژدانو بەسوود بۆ خۆمانو کۆمەڵگەکەمان! شەقامو کۆڵانەکانی ئێمەش وەکو شەقامەکانی وڵاتان پاکوخاوێنو جوانو ڕازاوە دەبن!!

محەممەد هاشم

# کێ زیرەکترە: ئێمە، یان حکومەت؟

کابرایەك، بۆ گەشتێك ڕووی لە گوندێكی دوورەدەست كرد، لەو گوندەدا خانوویەكی جوانو ڕازاوەی لێبوو، -خەڵكی ئاپۆڕەیان لە بەردەمیدا بەستبوو- سەرنجی كابرای ڕاكێشا. ئیدی بە سەرسامییەوە پرسی: ئەم خانووە زۆر خۆشە، هی كێیە؟

ئەو شۆفێرەی لەگەڵیدا بوو، خەڵكی ئەو گوندە بوو، بە بۆڵەبۆڵێكەوە گوتی: بەناوهێنانی ئاگری ڕق، لە دڵمدا هەڵدەسێت، ئەمە هی ئەو (سیسە، پیسە، نەگریسەیە)، كە حكومەت بۆ سەرپەرشتیكردنی كاروباری گوندەكە، ڕەوانەی كردووە.

كابرا، بەم وەڵامە حەپەسا. هەر كەسێكی لە خەڵكی ئاوایی دەبینی، هەمان پرسیاری لێ دەكردەوە، ئەویش هەر هەمان وەڵامی «سیسی پیسی نەگریس»ی لێ دەبیستنو كەسێك نەبوو دانی خێری پێدابنێت.

یارۆی گەشتیار، بڕیاری دا، سەردانیماڵی ئەم ڕەزاتاڵە بكات، تا لە نزیكەوە بزانێت چی دەكات، كاتێك چووە ناو ماڵ، جووتیارێكی زامداری بینی، لە بەردەم خاوەنماڵدا ڕاوەستاوەو تیماری دەكاتو زامەكانی دەپێچێتەوە. بەسەرسوڕمانەوە لێی پرسی: ئاخۆ تۆ پزیشكیت؟! لە وەڵامدا گوتی: نەخێر.

پاشتر جووتیارێكی دیكە هات، سەبارەت بە چاندنی زەوییەكەی، پرسوڕاوێژی پێكرد. ئەویش بە تێروتەسەلی بۆی ڕوون كردەوە، پاشان چووە لای یەكێكی دیكەو بڕێك پارەی پێدا.

كابرای گەشتیاری میوان، لەو گوندە هیچ كەسێكی نەدیبوو، بە ئەندازەی ئەو پیاوە، دڵنەرمو تێگەیشتووتر بێت، دواتر ماڵئاوایی لێكردو پاش ئەوەی لە ماڵ هاتە دەر، لەبەر خۆیەوە گوتی: ئای چەندە كەسێكی چاكو پاكە!

كاتێك پیادەیەك، ئەمەی لەم گەشتیارە نائاشنایە بیست، مۆڕەی لێكردو چاوی لێ زەق كردەوە، هەردەتگوت لە بەرامبەر ئەو قسەیەی گوتوویەتی، دەیەوێت مستەكۆڵەیەكی لێ بدات.

لێرەدا شێتی لەسەری كابرادا هاتەكوڵو بەرەو لای هاوڕێیەكی ملی ڕێی گرتەبەر، كە دانیشتووی گوندەكە بوو، كاری دادگاو پارێزەری بۆ خەڵكەكەی دەكرد.. لێی پرسی: ئایا ئەو كارمەندەی لەم گوندە بەرپرسە، دزی دەكات؟!

هاوڕێیە پارێزەرەكەی گوتی: هەرگیز ڕێی تێ ناچێت، چونكە لە خێزانە هەرە دەوڵەمەندەكانە.

دیسان لێی پرسی: ئاخۆ بەرژەوەندییەكانتان، بە هۆی ئەوەوە، پەكیان كەوتووە؟!

گوتی: پێشتر پەكیان كەوتبوو، بەڵام لەو كاتەوە كە ئەو پێی ناوەتە ناو ئەم گوندەوە، هەر هەمووی چاك بووەو هاتوونەتە سەر ڕاستەڕێ.

جامی تووڕەیی كابرا، سەرڕێژی كردو گوتی: من هیچ سەر لە ئێوە دەرناكەم. چونكە ئەو وەها دەردەكەوێت، پیاوێكی چاكو پاك بێتو تۆش دەڵێیت: كاروبارەكانتان چاك ڕادەپەڕێنێتو درێغی ناكات.. كەچی ئێوە ڕقتان لێیەتی، گرفتەكە چییە؟ دەی ئەگەر ئێوە خۆشتان ناوێت، بۆچی بەردەم دادگای لێناگرنو گازندەی لێناكەنو لە كونجی بەندیخانەدا توندی ناكەن؟

پارێزەرەكە دۆسییەیەكی گەورەی لە جانتاكەیدا دەرهێناو گوتی: تەماشا بكە، ئەمە ئەو هەزاران گازندە بێسوودەیە، كە بۆ حكومەتمان ناردووە. وا دیارە ئەم سیسە پیسە نەگریسە، تا پشوومان لەبەر نەبڕێت، لە كۆڵمان نابێتەوە.

لەم كاتەدا ئەوەندەی تر سەرسام بوو، لەبەرئەوە لە دڵی خۆیدا بڕیاریدا، تا بە تەواوەتی هۆشوگۆشی لە دەست نەداوە، ئەم گوندە چەپەكە بەجێ بهێڵێت. لێرەدا پارێزەرەكە بە ئەسپایی بە گوێی هاوڕێیەكەیدا چپاند: لە نهێنییەكەی ئاگادارت دەكەمەوە، لەڕاستیدا لە ڕێگەی ئەو ئەزموونانەی لەگەڵ حكومەتدا هەمانن، بۆمان دەركەوتووە: كاتێك ئەوان كارمەندێكی چاكمان بۆ دەنێرنو پێی دڵخۆشین، یەكسەر دەست بە گۆڕینی دەكەن، ئەگەر كارمەندێكی خراپیش بنێرن، گلەییو گازندەو ڕقو قینی خەڵكی ئاواییش لە دژی زۆر دەبێتو ئەوانیش دەیهێڵنەوە. سا لەبەرئەوە هەموومان هەروەك برا، كۆڵكو تەبا، لەسەر ئەوە ڕێككەوتووین كە ناشیرینترین تەوسو تەشەری لێ بدەین، تا بۆ ماوەیەكی دوورودرێژ، لەگەڵماندا بمێنێتەوە.

دەسا ئەگەر چاكە لە دەرگای دایت، كەمتەرخەمی مەنوێنە، هەل بە دەرفەت بزانەو بەكاری بهێنە. هەروەك خەڵكی ئەو ئاواییە، بە زرنگیو زیرەكی لە پێناویدا بجەنگە. نەهێڵیت ڕووكەشی شتەكان، لە خشتەت ببەن. هەوڵ بدە بۆ خۆت قوڵایی ڕاستەقینە بپێویت.. چونكە چەندان ناشیرین هەن، لە ژێر بەرگەكەیاندا ڕەزاشیرینیو ئاكارجوانییان حەشارداوە، كوردیش دەڵێت: ڕاستە كە مێوژ ڕەشە، بەڵام خۆ تامی خۆشە.

سەرچاوە/ علاقات: ٥٣



هۆزان جەلیل حەمە سەلیم



# پێشکەوتنەکان بەئازارن!

دڵنیام بە ڕوانین بۆ ناونیشانی سەرسووڕمان دەبێتە میوانی زەینمان، ئەوەی هۆکاربوو تا ئەم بابەتە بخەمە سەر پەڕەکانی ئەم گۆڤارە ئازیزە، ناخم بوو کە تراژیدیایەکی زۆر بە ئێش ئازاری دەدا، دڵنیابووم ئێوەی دۆستانم هاوکارم دەبن بۆ کەمکردنەوەی ئەم ئازارە بەسوێیە.

ڕۆژێك تێپەڕ دەبووم بە یەکێك لە کۆڵانەکانی شاردا، بەشێوەیەك مرۆڤەکان سەرقاڵی کاروفەرمانی ڕۆژانەیان بوونو پێشوازییان لە ژیان دەکرد، منداڵەکان لەگەڵ ئاوابوونی خۆردا ماڵئاواییان لە یەکدی دەکردو باوکە شەکەتەکان دەبوونەوە میوانی ماڵەکانیان، تا بە ئاسودەییو بە ختەوەری لەگەڵ خانەوادەکەیان ژیان بەڕێ بکەن، لە چرکەساتێکدا هاواری مرۆڤەکان شادییان گۆڕی بۆ شینو زەردەخەنەکان گۆڕان بۆ گریان، لەگەڵ خۆرئاوابوونی شاردا خۆری خانەوادەیەك کۆتایی هات، ئەو خۆرەی سات بە سات لەگەڵ لای لایەو زەردەخەنەکانی کۆرپەکانی پەروەردە دەکرد، بەو ئامانجەی لە داهاتوودا نەوەیەك پێشکەش بە مرۆڤایەتی بکات، مرۆڤایەتی بەرەو کەناری ئاسوودەییو کامەرانی بەرێت.

لەگەڵ گەیشتنم بۆ ناو ئەو کارەساتە تراژیدیایە ڕووفاتی دایکێکی ئازیزم بینی کە کۆرپەکانی چاوەڕوانی لای لایەو بزەو باوەشە گەرمەکانی دایکیان بوون، بەرەو دوا مەنزڵی هەمیشەیی بەڕێیان دەکرد، گریانو هاواری ڕۆڵەکانی ئەوەندە کاریگەربوون ناخی مرۆڤەکانی دەهەژاند، دڵەبەردەکانی نەرم دەکرد، بێ زمانەکانی دەهێنایە گۆ، چونکە دایکێك لە پێناو دابینکردنی ژینگەیەکی دروست بۆ منداڵەکانی لەگەڵ دەرکەوتنی ڕۆژێکی نوێ تا خۆر ئاوابوون هەوڵو کۆششی دەکرد، ژینگەیەکی بۆ فەراهەم کردبوون لێوان لێو بوو لە خاوێنیو ژیانێکی دروست بۆ بەخشینی نەوەیەك بە مرۆڤایەتی کە ببنە خاوەن بیرو هزرێکی دروست.

ئەو ژینگەیەش لەگەڵ پێشکەوتنەکاندا بەرەو پێشچوونی پێوە دیاربوو، چونکە بمانەوێت، یان نا، پێشکەوتن لە گێتیدا بەردەوامە، سات لەدوای سات چرکە لە دوای چرکە ئەم پێشکەوتنانە دەبێتە میوانی هەموو کوچەو کوڵانەکانی نیشتمانمان، ماڵەکانی منو ئێوەو ئەو دایکە ئازیزە لەو پێشکەوتنانە بەدەر نینو نابن، لەم ساتەشدا مرۆڤەکان زۆر بە سادەو سانایی پێشوازی دەکەن لەم پێشکەوتنانە، بەبێئەوەی هەوڵو تەقەلاکان بخەنە گەڕ لە پێناو سوود وەرگرتن لە لایەنە باشەکانی ئەو پێشکەوتنانە، ڕێگری کردن لە زیانەکانی.

گرنگە مرۆڤەکان خاوەن بەرنامەو پلانو ڕۆشنبیری گشتی بن، بۆ بەرەنگاربوونەوەی نەخوازراوەکان، تا پێشکەوتنەکان لە دەرئەنجامدا هەموو مرۆڤەکان بەرەو کەناری خۆشبەختیو کامەرانی بەرێت.

بەڵام بەداخەوە ئەو وێنە تراژیدیایەی کە کاریگەری لەسەر هەستم کرد، ئەو دایکە میهرەبانەی بۆ نەوەکانی خۆری ماڵەکەی بوو، سەرچاوەی ئارامیو کامەرانی خێزانەکەی بوو، لەبەرەنجامی بە سانایی ڕوانین بۆ پێشکەوتنەکانو هەستکردن بە لایەنە باشەکانیو هەست نەکردن بە زیانەکانی، هێواش هێواش پێشکەوتنەکان بووە دوژمنو جەستەی ئەو دایکە میهرەبانەی تەنیو بەرەو کەناری مەرگ ڕەوانەی کرد!

لە کاتێکدا ئەم دایکە میهرەبانە بۆخاوێنکردنەوەی ناوماڵەکەی، پاکژکەرەوەی کاشیو ئاوەڕۆکانی بەکاردەهێنا، لە ئەنجامی زۆر بەکارهێنانی ئەو ماددانە بووە هۆی زیانگەیاندن بە تەندروستی ئەو دایکە میهرەبانە، چونکە هەندێ لە ماددەی کیمیاوی ترسناکی تیادا بوو کە زیانی گەیاند بە کۆئەندامی هەناسەی.

دوژمنێکی ئەوەندە زۆرزان بەبێئەوەی هەست بکات بووە مۆتەکەو لاشەی ئەو دایکە میهرەبانەی تەنیو کردی بە هاوڕێی خاك، نموونەکان زۆرن کە دەرهاویشتەی

پێشکەوتنەکانن، ئەم جارەیان ماددە پاکژکەرەوەکان لە ماڵی ئەو دایکە میهرەبانەدا بەکاردەهات تا نەوەکانی لە ژینگەیەکی خاوێندا خۆشبەخت بژین، ژیانی بۆ نەوەکانی هەڵبژارد، بەڵام مردنی بۆ خۆی هەڵبژارد لە دەرئەنجامی هەڵمژینی ماددە کیمیاوییەکانی ناو ماددە پاکژکەرەوەکان، ئەو دایکەی بەرەو ماڵی هەتا هەتایی ڕەوانە کرد، چی لە ماڵێك بکرێت پاکژو خاوێن بێت، بەڵام مرۆڤەکان نا تەندروست ژیانی تیا بگوزەرێنن.

لەم سەردەمەدا ئەرکی سەرشانی بەرپرسانو میدیاکانو هەموو تاکێکی ڕۆشنبیرە ڕێنماییو هۆشیارکردنەوە ببەخشن بە هەموو خۆشەویستانو دۆستانیان تا بە شێوەیەك مامەڵە بکەن ڕێگری لە زیانەکانی پێشکەوتنەکان بکەین، ئێمەش هزرمان کراوە بێت بۆ وەرگرتنی زانیاری گشتی، وەك دانایەك دەڵێت:

ئەو کەسەی ماسییەکم پێشکەش دەکات بۆ ئەوەی بیخۆم، مانای وایە خواردنی ڕۆژێکی پێداوم، بەڵام ئەو کەسەی فێرم دەکات چۆن ڕاوی ماسی بکەم، ئەوا بەدرێژایی ژیانم ماسیم پێشکەش دەکات.

ئەگەر خاوەنی زانیارییەکی کەمیشبین لە پێناوی ئەوەی ئاسوودەبین با پەیامی دڵسۆزیو مرۆڤدۆستیو چاکەخوازیو هاوکاریو بەخشینی زانیاری هەڵگرین، تا مرۆڤەکان ئاسوودە بژین، بەختەوەر بمێنن، ئازیزانم حەسەنی کوڕی عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: خەڵکی فێری زانست بکە، زانستیش لە خەڵکییەوە فێربە، بەو شێوەیە تۆ زانستت تەواوکردووە، فێری ئەوەش دەبیت کە نەتزانیووە.

پێغەمبەرمان موحەممەد (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (ئەو کەسەی ڕێگەیەك بگرێتەبەر، بۆ ئەوەی زانستێك فێر بێت، خوا دەیخاتە سەر ڕێگایەك لە ڕێگاکانی بەهەشت)، بۆیە لەم ڕوانگەیەوە با هەوڵ بدەین بۆ ڕۆشنبیرکردنی تاکەکان.

ئازیزانم، مەرج نییە هەموو مرۆڤە خوێندەوارەکان ڕۆشنبیر بن، هەموو مرۆڤە نەخوێندەوارەکان نارۆشنبیر بن، واتە دەتوانین مرۆڤە ڕۆشنبیرەکان ناوزەند بکەین، کە گشتگیرانە دەڕوانن بۆ ژیان، هەوڵ دەدەن لە گشت بوارەکانی ژیاندا ڕۆشنبیری هەبێت، با هەوڵ بدرێت لە هەر داهێنراوێکی نوێ، ئێمەی تاك زانیارییەکی گشتی دەربارەی بزانین تا زۆرترین سوود وەرگرین، هەڵوێستە بکەین لە کاتی گەیشتن بە زیانەکانیو لە کاتی ئەگەری هەرهەڵەیەك پەندوەربگرینو هەموو ئەو ئەو پەندانە بکەین بە ئەزموونو لە داهاتوودا سودی لێوەرگرین.

لە کۆتاییدا هیوادارم هەمیشە هەوڵ بدەین زانیاری فێربین، زانیاریش ببەخشین تا هەمووومان پێکەوە لە هەوارێکی ئاسوودەو تەندروستدا بژین.



# با دڵۆپە ئاو بین، نەك بەرد!

و: بەشیر خالید

بابڕوانینە دوو دڵۆپە ئاو، گەر بکەونە پاڵ یەکو بەریەك بکەون، چیان بەسەردێت؟!

ئەوان وێنەی یەکتر لە ناو خۆیاندا دەبینن، یەکدەگرنو دڵۆپە ئاوێکی گەورەتر پێکدەهێنن، بەڵام ئەگەر دوو بەرد لە یەکتر نزیك بکەونەوە هیچ کات یەکناگرن، بەڵکو لەگەڵ بەریەککەوتنیاندا یەکتر دەشکێنن.

هەرچەندە ڕەقترو سەختتربین، تێگەشتنو قەناعەتمان بەشتەکانی دەرەوە کەمتر دەبێتو بەمەش ئەگەری گەورە بوونمان زۆر کەم دەبێت، بۆیە (نەرمونیانی، لێبووردەیی، خۆگونجاندن) لەو بەهرانەن یارمەتیمان دەدەن کە کەسێکی گەورەو کۆمەڵایەتی بینو بەسەر ئاستەنگەکاندا سەربکەوین.

ئێستاش با لە ڕوانگەیەکی ترەوە سەیری بابەتەکە بکەین:

وایدابنێین بەردێك لە ڕوویەکی لێژەوە بەرەو خوارەوە بەربێتەوەو بەر بەربەستێك بکەوێت، چی ڕوودەدات؟!

١- ئەگەر بەربەستەکە بچووك بێت، بەسەریدا تێپەڕ دەبێت.

٢- ئەگەر مامناوەند بێت، بەردەکە تێکی دەشکێنێت.

٣- بەڵام ئەگەر بەربەستەکە بەهێزو گەورە تر بوو، ئەوا ئەگەر بەردەکە تێکنەشکێنێت لانی کەم دەبێتە هۆی وەستاندنو دەستەوسان کردنی.

بەڵام بابزانین ئەگەر ئاو بکەوێتە وەها بارودۆخێکەوە چی بەسەردێت؟!

١- سەرەتا هەوڵدەدات بەربەستەکە لەگەڵ خۆی بەرێت.

٢- ئەگەر نەیتوانی، ئەو کات بەبێ سەرئێشە بەدوای کەمترین بواری دەربازبووندا دەگەڕێت.

٣- دیسان ئەگەر نەیتوانی چاوەڕوان دەبێت، تاوەکو بە تێپەڕبوونی کات خۆی بەهێزتر دەکات، ئەو کات یان بەسەریدا تێدەپەڕێت، یان تێکی دەشکێنێتو درێژە بە گەشتەکەی دەدات.

ئێستا تۆ بڕیاربدە، کامیان بەهێزترەو توانای خۆگونجاندنی زیاترە ئاو، یان بەرد؟

ئاو لەگەڵ ئەو نەرمیو ناسکییەی خۆیدا بە بەراورد لەگەڵ بەرد کەچی زۆر سەرسەختترو بەهێزترە، چونکە بەرد لە بەردەم بەربەستی بەهێزدا دەستەوسان دەبێتو توانای جوڵەی نامێنێت، بەڵام ئاو بە هەر شێوەیەك بێت ڕێگای خۆی بەرەو دەریا دەدۆزێتەوە.

ماوەتەوە بڵێین: لەو پەندانەی لەم بەراوردەوە وەردەگیرێت ئەوەیە واتاکانی سەرسەختیو سووربوون بە دڵنەرمیو لێبوردەییو خۆگونجاندن بەرجەستە بکەین، واتە با ئەو بەربەستانەی کە بەزۆری هێزو بە ڕەقیو توندوتیژی بۆمان تێکناشکێنرێن، بە نەرمی خۆمانیان لەگەڵدا بگونجێنینو بەسەریاندا سەربکەوین.

# ئێوە لە هیچتان کەم نییە!

ئاسۆ حاجی

لە دنیادا بەشی من ئەوەبوو کە ئێستا هەیە، سوپاس بۆ خوای گەورە کە وای بۆ دانابووم، چونکە خۆی چاکتردەزانێت، چی باشە بۆ من، من هەر لەزگماکییەوە گوێیەکانم هیچی نەدەبیستو زووبانیشم نەیدەزانی وشەیەك بڵێت، چونکە کەڕولاڵ بووم.

ڕۆژانی ژیانم هەر لە منداڵییەوە بەم چەشنە بردەسەر کە نە وشەی دایەو بابە تێدەگەیشتم، نە دەشمزانی ناویان بهێنم، جگە لەوان ناوی کەسانی دەوروبەریشم، پێداویستییەکان، جوانییەکان، ناشرینییەکان، ناوی ڕەنگەکان، خۆشحاڵیو نارەحەتیم تەنانەت ناوی بەندەیەکی خوداشم پێ دەرنەدەبڕا، لە کەسیش نەدەگەیشتم چی دەڵێن، تەنها دەمدیت هەردوو لێویان دەجولاندو ددانەمروارییەکانیان دەردەکەوت کە هەندێجار پێدەکەنینو هەندێجار دەگریانو فرمێسکیان دەڕشت، بەڵام من لە هیچ نەدەگەیشتم تەنها ئەگەر بە جوڵەی دەستەکانیان شتێکیان دەربڕیبا، زۆرجار باش نەیاندەزانی پێم بڵێن، یان تێم بگەیەنن.

ڕۆژان هاتو شەوی بە دوای خۆیدا هێنا، تا تەمەنم گەیشتە قۆناغی خوێندن، بەڵام لە قوتابخانەی ئاسایی منیان وەرنەدەگرت، بۆیە هەردەم نیگەران بووم، هەرکاتێکیش شەو دادەهات بە تەنها سەیری پەرتووکەکانی خوشكو براکانم دەکردو حەزم دەکرد بزانم چی تیانووسراوەو ئەم وێنە ڕەنگاو ڕەنگانەی ناو پەرتووکەکان باس لە چی دەکەن، زۆر بە دیاریانەوە دەمامەوە، سەرەنجام هیچی لێ تێنەدەگەیشتمو بە دڵی پڕ لە خەماوی بە جێمدەهێشتو بە تەنیا دەچوومە ژوورەکەمو هێدی هێدی دەگریام، چونکە زۆربەزەییم بە خۆمدا دەهاتەوە، هەتا خەو دەی بردمەوە بە دەم گریانەوە، ئەگەر میوان، یان دۆستو کەسەکان شتێکیان وتبا، تەنانەت خزمەکانیش کە بە سەردان دەهاتن دەیانگوت: کێ لە ماڵەوەیە؟! بە ئیشارەت دەمگوت من بە تەنها، دەیانگوت: ئەی لە کوێن؟! نەمدەزانی بڵێم چی، نەشم دەزانی چییان دەوێت، هەر دوولا بێ وەڵام دەماینەوە.

نەمامی تەمەنم وەکو دارچنار هێدی هێدی هەڵدەکشاو شوێن پێی ئەمڕۆم بەجێدەهێشتو هەنگاوم بۆ سبەی دەهاویشت، کە ئەویش دەبێتە ئەمڕۆ، ئەمڕۆش دەبێتە دوێنێ.. تا کاتێك هەستم کرد گەیشتووم بە تەمەنێك دڵم پڕ لە ڕستەو وشەیە، شەوانەش خەونی زۆرم دەدیت، بەڵام نەمدەزانی چۆن باسی بکەم ڕووداو گەلێکم دەدیت چەند زستانو بەهارم بەڕێ کرد، بە بێئەوەی ناوی بەفرو بارانو ناوی یەك گەڵاو گوڵو درەختو باڵندە ڕەنگاو ڕەنگەکان بهێنم، ئێوە نازانن لە حاڵی من ژانو ناسۆری دڵەی خەمباری من، چونکە ئێوە لە هیچتان کەم نییە تەنها سوپاسکردنی خودا نەبێت، بەڵام ئێمە بە شوکری خوداوە دەژین ئەگەر نا ئەو دڵە بچکۆلانەیە بەرگەی ڕۆژێکی ژیانی نەدەگرت، چونکە چی هەیە لەوە ناخۆشتر لە ناو کەسانێکدا بژیت نەلێیت تێبگەنو نەلێیان تێبگەیت، لەو کاتەدا خۆت زۆر بە نامۆ دێتە پێش چاو، لە ناو ئەو هەزار بە هەزارەی دروستکراوی خودادا.

ئەو کاتەش کە گەیشتم بە تەمەنی لاوی، منیش وەکو کەسانی ئاسایی دڵم پڕ بوو لە خۆشەویستی، بە تایبەتی ناسیاوێکی خۆمان کە زۆرم خۆشمدەویست، بەڵام نەمدەزانی چۆن حاڵی بکەم، چی پێبڵێم، کە زوو زوو دەهاتە ماڵمانو سەردانی دەکردین، کەسێکی زۆرچاك بوو، خێزانەکەشیان زۆر بە بەزەییو خزمدۆست بوون، هەرجارێك کە دەمدیت دڵم پەرێشان دەبوو، چاوەکانم پڕ لە فرمێسك دەبوون، دوای ڕۆیشتنی زۆرجار، یەك دوو ڕۆژ لە ناخەوە هەر خەمبار دەبووم، لە ناکاو ڕۆژێك هاتە ماڵمان کۆمەڵێك کاغەزی پێبوو، بە پێکەنینەوە هاتە ژوورێو دەستی بڵند کرد کە مەبەستی سڵاو کردن بوو، بە تایبەتی لەگەڵ من، یەك لە کاغەزەکانی دایە دەستی دایکمو چەند قسەیەکیان کرد، بەڵام من هیچ تێنەگەیشتم دوای ڕۆیشتنی بە ئیشارەت لە دایکم پرسی ئەوە چییە؟! ئەویش تێی گەیاندم کە ئەمە کارتی بووکگواستنەوەیە بۆ خۆی، منیش ڕەنگم گۆڕاو ڕام کرد بۆ ژوورەکەم کە تاکە پەنام بوو لێم تێبگات.

چونکە هەر لە منداڵییەوە بە یەکەوە بووین لە حاڵی پەرێشانو لە فرمێسکی شەوانەم دەگەیشت، بۆیە چوومەلای ئەوو دەرگام لەسەر خۆم داخست، تا بۆ حاڵی خۆم تێر تێر گریام، کە نەمتوانی حاڵی بکەم کە خۆشم دەویست، ئەویش لە من حاڵی نەدەبوو، لە منی بێ زمانو بێ گوێ، کە هەستی پێبکات دوای گواستنەوەی چەند جار دەهاتن بە خۆیو خێزانەکەی زۆر لە



لامان دەمانەوە، بەتایبەتی خێزانەکەی منی زۆرخۆشدەویست، لەگەڵم دادەنیشتو هەربە ئیشارەت قسەمان بۆ یەك دەکرد، هەر چەند لە هەموو شتێك حاڵی نەدەبووین، بەڵام هەردەم بەرامبەرم زەردەخەنەی دەکردو پێدەکەنی، منیش لە ناخی خۆم دەمگوت خۆشی لە خۆت ئاگات لە حاڵی دڵو زوبانی من نییە.

سەردانیان بۆماڵمان بەردەوام بوو، تا ڕۆژێك خێزانەکەی هات پێی وتمو حاڵی کردم کە قوتابخانەیەك کراوەتەوە بۆ کەڕولاڵانو منی لەگەڵ خۆی برد ناوی نووسیمو وەرگیرام، منیش زۆر دڵخۆشبووم، بەڵام نەمدەزانی چۆن سوپاسی بکەم.

لەوساتەوە چووم بۆ ئەو قوتابخانەیە لەوێ خوێندم، پاش ماندووبوونێکی زۆرو ساڵانێك لەگەڵ قوتابییە هاوشێوەکانمو مامۆستا دڵفراوانو ئازیزەکان، فێری خوێندنو نووسین بووم، ئێستا دەتووانم هەموو شتێك بنووسم، دەتوانم بنووسم: دایە، بابە، چەندم خۆشدەوێن، ئەوانیش دەتوانن بۆم بنووسنەوەو وەڵامم بدەنەوە.

ئێستا دەتوانم سوپاسگوزاری ئەگەر بە زووبانیش دەرنەبڕم، بەڵام بە نووسین هەڵیرپێژمە سەرسینەی پەڕە بێگەردەکانو کەمێك خەمم بە بابدەمو باری دڵم سوك بکەم، ئێستا زوو زوو سوپاسو خۆشحاڵی خۆم بۆ ئەو کەسە دەنێرم کە دەستی گرتم بەرەو ئەو نیعمەتە گەورەیە، چونکە دەتوانم کارەکانی خۆم جێبەجێ بکەمو تەنانەت لە نێو مۆبایلەکەشم زۆر وتەی بە سوودو نوکتەی خۆش خۆشی تیادایە کە لە بۆنەکانا، یان لە بەسەرکردنەوەیان بە نامەی مۆبایلی بۆیان دەنێرم.

دووبارە دەڵێم زۆر سوپاس بۆ تۆ خودایە، دەرگای ئەو نیعمەتەت لێکردمەوە، لە بەرامبەر نیعمەتێکی تر، ئەگەر گوێو زمانم کاری خۆیان ناکەن، بەڵام چاوەکانم ساغن دەبینم، دەستەکانم، پێیەکانم، ئەندامەکانی ترم ساغو تەندروستن، ئەی چۆن دەبێت ئێوەش سوپاسگوزاری خودا نەکەن؟! کە هەموو ئەندامەکانتان سەلامەتە، یان هێشتا قەدری ئەو نیعمەتانەو حاڵی پەرێشانی وەك ئێمەتان نەزانیوە؟!

# چۆن جیهان بە سەوزی دەبینیت؟

ئەسکەندەر ڕەحیم



دەگێڕنەوە لە وڵاتی یاباندا ملیۆنەرێك هەبوو، بە دەست چاوئێشەوە گرفتار ببوو، بە تەواوی خەو لە چاوی تۆرا بوو. بۆ دەرمانی دەردی چاوی، چەندان دەرمانی خواردبوو، چەندان دەرزی لە خۆی دابوو، بەڵام هیچ ئەنجامێکی باشی نەبوو.

ئەو پاش ئەوەی هەموو ڕاوێژو سەردانە پزیشکییە زۆرەکانی، دادی نەداو کەڵکێکی وەهای نەبوو، کە جێی باس بێت، سەردانی دانایەکی کرد. ئەویش پاش تەماشاکردنی چاوی کابرا، پێی گوت: دەبێت بۆ ماوەیەك جگە لە ڕەنگی سەوز تەماشای هیچ ڕەنگێکی دیکە نەکەیت. کابرای نەخۆش پاش ئەوەی داناکەی بەجێهێشتو بەرەو ماڵ گەڕایەوە.. فەرمانی بە هەموو خزمەتکارەکانی خۆی کرد، کە تەواوی خانووەکەی، سەوزپۆش بکەن، هەروەها هەموو کەلووپەلی خانووەکە، بە کەلوپەلی ڕەنگ سەوز بگۆڕن.

پاش ماوەیەکی دیکە فەرمانی دا بە گۆڕینی جلوبەرگی ئەندامەکانی خێزانەکەیو خزمەتکارەکانی بە ڕەنگی سەوزو پاشان ڕەنگی ئۆتۆمبیلەکەشی. ئیدی هەرشتێکی بەرچاو دەکەوت، دەبوو بە ڕەنگی سەوز بگۆڕدرایە، سابەڵکو ئێشی چاوی بنیشێتەوە.

پاش ماوەیەك بۆ سوپاسکردنی داناکە، بانگهێشتی کردو میوانداریيەکی بۆ سازاند. داناکەش بە بەرگێکی پرتەقاڵییەوە بەرەو ماڵی ملیۆنەرەکە بەڕێکەوت، کاتێك هاتە ژوورەوە، هەستیکرد دەبێت پۆشاکەکەی بگۆڕێتو پۆشاکی سەوز بپۆشێت. هەر بۆیە داوای پۆشاکێکی سەوزی کرد، پاشان پۆشاکە سەوزەکەی پۆشیو چووە لای ملیۆنەری چاوئێشاوو، لێی پرسی: ئازاری چاوت چاك بووەتەوە؟ دەوڵەمەند سوپاسی کردو گوتی: بەڵێ، بەڵام گرانترین دەرمان بووە، کە تا ئێستە بە کارم هێنا بێت.

داناکە بە سەرسوڕمانەوە گوتی: بە پێچەوانەوە، ئەمە هەرزانترین دەرمانە، کە تا ئێستە نووسیومە، بۆ چارەی ئازاری چاوتان، هەر چاویلکەیەکی شوشە سەوزت بکڕیایە، ئەم هەموو خەرجییەی نەدەویست. تۆ بەم کارەت ناتوانیت تەواوی دنیا بگۆڕیت، بەڵکو بە گۆڕینی جۆری ڕوانینت، دەتوانیت بە ئارەزووی خۆت ببینیت!

# چەند وێنەیەك لە وتەی زێڕین

ئا: م. محەممەد مەلا مەحمود

ئاشکرایە زمان ڕۆڵی سەرەکی دەبینێت لە بەرجەستەکردنی ئاستی ڕۆشنبیریو کەسایەتی مرۆڤدا، بۆیە دەبێت هەموومان بە وریاییەوە مامەڵە لەگەڵ ئەم ئەندامەی جەستەماندا بکەین، بە شێوازێك بیهێنینە دواندن کە لە ڕەزامەندی خوداو پاشانیش بە سوودی خەڵکانی دەوروبەرمان بێت، بۆئەوەی خۆمان ئاسوودە بین‌و تا ڕادەیەکیش بتوانین ئاسوودە بەخشبین بۆ کۆمەڵگە.

بۆیە لێرەدا چەند نموونەیەك لە وتەی جوان دەکەینە دیاری خوێنەرانی بەڕێز، بەو ئومێدەی ئێمەش لە کەسانی بە ئەزموونەوە ئەزمونێك وەربگرین‌و بتوانین ئەوان ئاسا بدوێین، دنیاو دوارۆژمان بە خۆشی‌و خۆشەویستی‌و ئاسودەیی بنەخشێنین.

١. (عیمرانی کوڕی حەتیم) بە ڕووخسار پیاوێکی زۆر ناشیرین بوو، لەگەڵ ئەوەشدا جوانترین ژنی هۆزەکەی خۆی هێنابوو، ڕۆژێك (عیمران) هەستی بەوەکرد کە هاوسەرەکەی لێی بێزارەو دوورە پەرێزە لێی، ئەویش ویستی ئارام‌و ئاشتی بکاتەوە، پێی گوت: من بیرم کردووەتەوە لە ژیانی خۆم‌و تۆ، دڵنیابووم لەوەی کە هەردووکمان لە ئەهلی بەهەشتین، خێزانەکەشی وتی: چۆن؟ (عیمران) وتی: چونکە من بەو ناشیرینییەوە تۆم بەو هەمووە جوانییەوە پێبەخشراوە، سوپاسگوزاری خوای لەسەر دەکەم، تۆش منت بەو ناشیرینییەوە بە نسیب بووە، لەگەڵ ئەوەشدا ئارامگروخۆڕاگری، مرۆڤی ئارامگروسوپاسگوزاریش هەردووکیان لە بەهەشتدان، کەواتە منی سوپاسگوزارو تۆی خۆڕاگر، هەردووکمان لە بەهەشتداین.

وصايا زوجيه: مجيد سعيد ـ أسماء البكرى، ص ٤١ ـ ٤٢.

٢. (نوحی کوڕی مەریەم) قازی شاری (مەرو) بوو، کچێکی هەبوو ویستی بیدات بە شوو، دراوسێیەکی (مەجوسی) ئاگرپەرستیشی هەبوو، بۆ ئەم مەبەستە چوو بۆ لای دراوسێکەی‌و پرس‌وڕاوێژی پێکرد، سەبارەت بە بەشودانی کچەکەی، کابرای ئاگر پەرستیش لە وەڵامدا وتی: پاکو بێگەردی بۆ خوا، خەڵکی بۆ لای تۆ دێن بۆ پرسیارکردن‌و پرس‌و ڕاوێژ، کەچی تۆ ئێستا هاتوویت پرسیار لە من دەکەیت؟!!

(نوح)یش وتی: هەر دەبێت بۆچوونی خۆتم پێ بڵێیت سەبارەت بەم کارە، کابراش وتی: (کیسرا)ی پادشای (فارس) لە دونیادا ماڵ‌و سامانی هەڵدەبژارد، (قەیسەر)ی پادشای (ڕۆم)یش جوانی هەڵدەبژارد، سەرکردەکانی (عەرەب)یش بنەماڵەیان هەڵدەبژارد، بەڵام پێشەواکەی تۆ (محمد) (سەلامی خوای لێبێت) ئاینی هەڵدەبژارد، ئیتر تۆ خۆت سەرپشکبە بزانە کام لەمانە دەکەیت بە پێشەنگی خۆت لەم کارەدا.

مرشد الخطيب ودليل الباحث: عبدالرحمن المصطاوى: ص ١٥٨.

٣. دایکێکی دڵسۆز، ئامۆژگاری کچە خۆشەویستەکەی دەکرد کە تازە هاوسەرگیری کردبوو، چەند وتەیەکی زێڕینی پێشکەش کردو پێی وت: کچە خۆشەویستەکەم تۆ لە ژیانی ناو ئێمەوە دەچیت بۆ ناو ژینگەو شوێنێك کە پێشتر ئاشنای نەبوویت، بۆ پیاوەکەت ببە بە زەوی، ئەویش بۆت دەبێت بە ئاسمان، بۆی ببە بە کەنیزەك، ئەو بۆت دەبێت بە کۆیلە، با داواکارییەکانت زۆرو لە ڕادەبەدەر نەبن، با ڕقی لێت نەبێت.. زۆر لێی دوور مەکەوەرەوە، با لە بیرت نەکات، ئەگەر بەرەو ڕووت هات لێی نزیك ببەرەوە، ئەگەر لێت دوور دەکەوتەوە تۆش لێی دوور بکەوەرەوە، ئاگاداری گوێچکەو لوتو چاوەکانی بەو بیانپارێزە بۆی، با بەردەوام بۆنی خۆشت لێ بکات، با وشەی جوانت لێ ببیستێت، با هەمیشە بە جوانی‌و ڕازاوەییەوە بتبینێت.

وصايا زوجيه: مجيد سعيد ـ أسماء البكرى، ص ١١٤.

٤. (عبدالرحمانی کوڕی مەهدی) دەڵێت: لە لای تەرمێکدا بووین (عبدالله ی کوڕی حەسەن)یشمان تێدابوو، کە لەو کاتەدا (قازی) بوو، کاتێك تەرمەکە دانرا (قازی عبدالله) لە لای تەرمەکەدا دانیشت‌و خەڵکەکەش بە دەوری (قازیدا) دانیشتن، لەو کاتەدا پرسیارێکم کرد لە (قازی عبدالله)، بەڵام وەڵامەکەی ڕاست نەپێکا، منیش وتم: خوا چاکتبکات من نەمویست ئاوا هەڵە وەڵام بدەیتەوە، بەڵکو من ویستم لە ئێستات گەورەترت بکەم‌و لە ناو خەڵکدا ناووناوبانگت زیاتر بەرز بکەمەوە، قازیش ماوەیەك سەری داخست، پاشان وتی: ئەوا من پاشگەز بوومەوە لە وەڵامەکەم، من ئەگەر کلکی حەقێکبم خۆشەویستترە بەلامەوە لەوەی کە سەری باتڵ‌و ناحەقێکبم.

المنهجيه العامه: عبدالفتاح بن صالح اليافعى: ص ١٦ ـ ١٧.

# پێوەرەکانی تاك

شاخەوان جەبار

لە ڕەوڕەوەی ئـەم ژیانـەدا زۆرجار ئێمـە ئـەو کۆتوبەنـدە نەریتانـەی کە چەقبەسـتو بەدن بڕیـاری بەجێمان لە بـارەی خوێندنەوەی کەسـێتی تاکێکەوە بـە هەڵدێـرا ئەبـەنو کە زۆرجـار ئەم هەڵسـەنگاندنو بڕیارەمـان نـە لەگـەڵ ناخـی ئاینو نە لەگەڵ ئاقـڵو مەنتیقدا پێـك نایەتـەوە. ئەگـەر بێـتو ئایـنو یاسـامەنتیقییەکان بکەینـە پێوەرێك بۆ ئەو جۆرە بڕیارانەمان ئەوە دەسـتبەجێ دەگەین بەڕاسـتی ئەوەی کـە تاچەندێك ڕاستین، یان هەڵەین؟

جـا یەکێك لـەو نەریتانەی کە بڕیاری هەڵەمان پێ دەدات ئەوەیە کە ئێمە زۆرجار بـۆ هەڵسـەنگاندنی کاری بـاشو خراپـی تاکێـك لە بـری ئـەوەی کـە پێوەرەکانی تاکـی بـۆ بەکاربێنیـن، پێوەرەکانـی کۆی بـۆ بەکاردەهێنیـن، واتـە کاتێـك تاکێـك هەڵەیەك دەکات، ئەوە دەسـتبەجێ بڕیاری ئـەوە دەدەیـن کـە خێزانەکـەیو حیزبو دارودەسـتەکەی هەڵـەکارەو بـەر هەمـان هەڵوێستو بڕیاری نابەجێی ئێمە دەکەوێت، بە پێچەوانەشەوە، ئەگەرچیش وتەو کرداری تاکەکانی هەمان خێزان ئەسـتوون بێت بە بەراورد لەگـەڵ ڕەفتارەکانـی هەمان تاکی هەڵـەکاری خێزانەکـەدا، کەچی ئێمە تەڕو وشـك پێکەوە دەسـوتێنین، واتـە ئیدی بە چاویلکەی ڕەشەوە سـەیری سەرجەم وتەو کاری هەموو تاکەکانی ئەو خێزانە دەکەین. بە پێچەوانەشەوە بۆ کاری باشی هەمان تاك دیسان بە هەمان چەشن بڕیار دەدەین!

ئەمجـۆرە پێـوەرە کۆیـە هەڵەیە بە تایبەت لەم سـەردەمە جیهانگیرییەدا کە تاکەکانی خێزان زۆرجـار وارِوودەدات کە ئایدۆلۆژیـاو وتـەو کرداریان دژ بە یەکو ئەسـتوونن، بـەلام ئەوەشـمان لـە بیـر نەچێـت چۆنێتی پێگەیاندنـی تاکەکانی خێزان، ئەرکی سەرشانی دووجەمسەرەکەی خێزانە، واتە دایكو باوك، کە بەو جۆرەی پێویسـتە پەروەردەی بکەن، بەڵام کاتێك کە ئەو تاکە هەڵەیەك دەکات ئەمە مانای ئـەوە نییە دایكو باوك هەڵەکاربن، بەڵکو ئـەو تاکانە ئـەو کارەیـان لـە دەرەوەی چاودێری خێـزانو کەسـە نزیکەکانێتی، بۆیە ئەو جۆرە بڕیارانە هەڵەن بە تایبەت کاتێـك هەڵوێسـتەیەك لـە ژیاننامـەی پێغەمبەران (علیە الصلاە وسلام)دەکەین، دەرەنجامی ئەم ڕاسـتییانە بەدی دەکەین، کاتێـك دەبینین کـە پێغەمبەرێکی وەك نـوح ماوەیەکـی زۆری تەمەنـی بە کاری بانگـەوازەوە سـەرقاڵە، بـەڵام خێـزانو کوڕەکەی باوەڕیان پێی نییە.

ئیبراهیم کە باوکی باوەڕی بە پەیامی ئیبراهیـم نییە، ئەگەرچیـش بە هەموو شـێوەیەك بانگی دەکات تا ڕێگەی ڕاسـت وەرگرێت.

ئاسیای خێزانی فیرعەون کە باوەڕدارە، فیرعەونیـش خـۆی بە خودای سـەرڕووی زەوی دەزانێت. ئایا دەکرێت هەڵەی بێباوەڕی هەریەك لەمانە بکەینە ڕەخنەیەك لە کاری بانگـەوازی پێغەمبەرانـدا؟! یـان دەتوانین ئـەو مافە بە خۆمـان بدەین کـە بە هۆی پێغەمبەرایەتی هەڵەی ئەمانە هیچ نییە لە کاتێکـدا کە داوای نوح بـۆ کوڕەکەیو نزای ئیبراهیم بۆ باوکی هیچ لێبوردنێکی خودای بۆ هەریەك لەوانە نەهێنایە بوون. نەك هەر لەم دنیایەدا، بەڵکو لەدوارِۆژیشدا، بە هەموو پێوەرەکان جیاوازی تەواو لە لێپرسینەوەیاندا دەکات. لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کە خوای گەورە لە وەڵامـی داوای ئەو پێغەمبەرانەدا یاسـاو بەڵگەی پێوەرەکانی تاکی بەکارهێنا، نەك پێوەری کۆ.

# مرۆڤو بەهرەکانی

زاهیر زانا

ئێمەی مرۆڤ بەهرەو تواناى جۆراو جۆرو هەمەچەشنو گرنگمان پێ دراوە، بە جۆرێك ئەگەر بتوانین بیاندۆزینەوەو گەشەیان پێ بدەینو بەکاریان بهێنین بەشێوازی دروستو ڕێکو تەندروست، دەبنە هۆکاری سودو کەڵك بۆ خۆمانو دەوروبەرو خەڵك.

کاتێك مرۆڤ بەهرەکانی خۆی ناسیو خۆی دۆزییەوە کە لە چ بوارێکدا بەهرەمەندو لێهاتووەو ئەو بەخششە خواییەی بەکارهێنا، دەتوانێت پێشکەوتن لە ڕەوتی سەرکەوتنی خۆیدا بەدی بهێنێتو بەهرەکانی ببنە چرایەکی ڕووناکو پرشنگدارو ژیانی پێ ڕووناك بکاتەوەو ڕووەو هیواو ئامانجەکانی نزیکی بکاتەوە.

هەرکەس لە ئێمە ڕەنگە چەندین بەهرەی بە سوودو نایابو ناوازەمان هەبێت، بەڵام فەرامۆشمان کردوونو لێیان بێئاگاینو خۆزگەش بە کەسانێکی تر دەخوازین کە هەر وەك ئێمەنو تەنها بەهرەکانیان خستۆتە گەڕو تواناکانیان بەکارهێناوەو گەیشتوونەتە ئەو هیواو ئاواتانەی هەیانبووە! زۆرێك هەن وەك ئەم چیرۆکە پەند ئامێزەیان لێهاتووە کە دەڵێت: (جارێك جوتیارێك هێلکەی هەڵۆیەکی دۆزییەوەو لەگەڵ هێلکەکانی مریشکدا بە یەکەوە داینان تا هەڵهاتنو ئەم بەچکە هەڵۆیەش وەك جوچکەکانی مریشك گەورەبوو، وەك ئەوانیش هەڵسوکەوتی دەکردو هیوایەتی ئەوەبوو خوا بە هەڵۆ دروستی بکردایە، لەبەرئەوەی بەهێزو بە توانایەو دەچێتە قوڵایی ئاسمانو سەر لوتکەی چیاکان!!! بێ ئاگا لەوەی خۆی هەڵۆیە، بەڵام بەهرەی هەڵۆبوونی خۆی لە بیرکردووەو خۆی نەدۆزیوەتەوە).

دەبێت چەندجار خۆمان لێ ون بوبێت، چەندجار وێڵی شتێك بووبین، بەڵام لە ڕاستیدا خۆمان خاوەنی بووبێتینو نەمان زانیبێت، یان ڕاستر چەندجار خۆزگەمان بە هەڵۆبوون خواستبێت لە کاتێکدا خۆمان (باز) بووین، کە سەرداری باڵدارەکانی ئاسمانە! بۆیە پێویستە ئێمەش بیری خۆمانی بهێنینەوە کە دەتوانین ئەو بەهرانە بەکاربهێنین کە خوا پێی بەخشیوینو بگەینە ئاواتو مەبەستەکانمان، بە دڵنیاییەوە هەموو ئەوانەی کە خۆزگە بە هەبوونیان دەخوازینو خەونیان پێوە دەبینین بە زیادەوە خاوەنیانینو ئەو کانگا زێڕەی بە دوایدا دەگەڕێین وا لە ناو ناخماندایە.

مرۆڤ جێنشینی خوایە لەسەر زەوی، هەرخۆشی هەموو شتێکی پێ بەخشیوە، بۆئەوەی ژیان ڕامکاتو زەوی ئاوەدانو ڕەنگین بکات، بۆ ئەم کارەش هەموو شتێکی پێداوین، هەر مرۆڤێك چەندین بەهرەی بەسودو بێ وێنەی هەیە، بەڵام خۆمان فەرامۆشمان کردوون، هەندێجار لە کاتی بینینی نیگارێکی هونەری، پێشبڕکێیەکی وەرزشی، یا دروستکردنی ئامێرێکی تازە، یان کارێکی ناوازە لە لایەن کەسانی ترەوە سەرسام دەبینو بەشتێکی ئەستەمو مەحاڵ دەیدەینە قەڵەم، لە کاتێکدا ئەوانەش مرۆڤانێکن وەك ئێمەو تەنها بەهرەو تواناکانی خۆیان بەکارهێناوەو هەوڵیانداوەو تاقیانکردونەتەوەو بە پلیکانەکانی سەرکەوتندا هەڵگەڕاونو لە شکست نەترساونو متمانەیان بە بەهرەکانی خۆیان هەبووە، تا دواجار گەیشتوونەتە ئامانجو توانیویانە لەو بەهرەیەی پێیان دراوە بەهرەوەربن.

با بڕیاربدەین، بەهرەکانی خۆمان بناسینو بزانین لە چ بوارێکدا بەهرەمەندین، تا بتوانین خۆمان سەرقاڵی ئەو لایەنە بکەین، چونکە بەرهەممان باشتر دەبێتو دەتوانین داهێنانی تیا بکەینو کارەکانیشمان ئاسانتر ئەنجام دەدرێنو کانی بەهرەکانمان دەتەقێنو دەژێنەوەو ڕۆژ بە ڕۆژ توانای بەرەو

پێشچوون و گەشەکردنمان باشتر دەبێت. بە پێچەوانەشەوە بە بەکارنەهێنانیان کوێر دەبنەوەو دەپوکێنەوە، لە ناودەچن و دەتوێنەوە. بە نەزانین و نەناسینی بەهرەکانمان دەستخەڕۆو ڕەنجەڕۆ دەبین، هەروەك دەگێڕنەوە: (لە یەکێك لە وڵاتە ئەفریقییە هەژارو نەدارەکاندا کەسێك هەبوو زەوییەکی فراوانی هەبوو، بەڵام ئەو زەوییە هیچ سوودێکی بۆ ئەو نەبوو، چونکە زەوییەکەی وشك و بێ خێرو ڕەق و تەقبوو، ڕۆژ بە ڕۆژ هەژارترو نەدارتر دەبوو، بە شێوەیەك نزیکبوو لە برسێتیدا دەمرد، ڕۆژگار هات و ڕۆیشت ئەم هاوڕێ هەژارە ئەفریقییەمان سوودێکی لە زەوییەکەی وەرنەگرت، ڕۆژێك لە زەوییەکەیدا وەستابوو کەسێکی سپی پێستی ئەورووپایی لێ دەرکەوت، دوای گفتوگۆ کابرای ئەورووپی ویستی زەوییەکەی لێ بکڕێت، خاوەن زەوی هەژاریش کە بڕوای وابوو زەوییەکەی بێ سودەو بەردەڵانە بە مامەڵەکە ڕازیبوو، تەنها بە چەند دۆلارێکی زۆر کەم زەوییەکەی فرۆشتە سپی پێستە ئەورووپاییەکە، بەڵام چی ڕوویدا؟! ئەو زەوییەی کە خاوەنەکەی بڕوای وابوو بێ خێرەو بەردەڵانە (کانی)ی ئەڵماس بوو، بەڵام خاوەنەکەی ئەم نهێنییەی نەزانیبوو، هەربۆیە هەرزان فرۆشی کرد، لە کۆتاییدا ئەم زەوییە بۆخاوەنە نوێیەکەی بوو بە خێرو بەرەکەت، ئەمەش تەنها لەبەرئەوەبوو کە خاوەنە کۆنەکەی ئەو زەوییەی خۆی نەناسیبوو!

دەبێت چەند کەس لە ئێمە لە ناخماندا بەهرەی مەزنی وەك کانی ئەڵماسی هەبێت و پەیمان پێ نەبردبێ و پشتگوێمان خستبێت!! چ کارەساتێکە ئەو کانە بەسودانەی خوا پێی داوین فەرامۆشی بکەین، جێی خۆیەتی لە دوای ئەو چیرۆکەی سەرەوە بەڵێن بدەین بۆ بەهرەکانی خۆمان بگەڕێین لە ناو خۆمانداو بەکاریانبهێنین و ڕێگە نەدەین کە برسی و لانەواز بین لە کاتێکدا کانی ئەڵماسمان هەیە.

تۆ مرۆڤیت، مرۆڤ خاوەنی بەهرەو توانایە، دەستت کراوەتەوە بۆئەوەی بنیاد بنێیت، بۆئەوەی بیدۆزیتەوەو بەدەستی بهێنیت، ڕامەوەستە سود لە بەهرەو تواناکانت وەربگرە، زەوی بگۆڕە بۆ بەهەشت و ژیانت بگەیەنەرە جاویدانی و بەختەوەری، بێگومان بە بەکارهێنانی بەهرەو توانا جوان و نایاب و بێ وێنەکانت.



# دڵگران و نائومێد مەبە!

ئەم بابەتە پەیامێکە بۆ ئەو کەسانەی کە نائومێدی و بێزاری بۆتە هاوڕێیان، پاشان بە هۆی دلگرانییەوە لە ژیان بێزارن و وادەزانن هیچ کات ژیان ئاسودەیی پێنەبەخشیون! بە داخەوە زۆرمان تائێستا واتای نائومێدی و هۆکارەکانمان نەبیستووە، نائومێدی کەلەپچەیەکی بەهێزە خاوەنەکەی لە هەموو جووڵەو توانایەك دەخات، مرۆڤی نائومێد خۆشییەکانی دنیا بە ناخۆشی و بێزاری دێتە پێش چاوی، کەسێکی ڕەشبینە، بەڵام کەسێك بییەوێت بە ڕێگاکانی ژیاندا بڕوات، بێگومان دەبێت جۆرەکانی ژیانیش بزانێت، هەروەك وتراوە: ژیان ڕێگایەکی دوورودرێژە دەبێت چاوەڕوانی خۆشی و ناخۆشییەکانی بیت، واتە: هەست بە سەرکەوتن ناکەیت هەتا شکست نەهێنیت، هەست بە پشوو ناکەیت، هەتا ماندوێتی نەچێژیت، هەست بە خۆشبەختی ناکەیت هەتا تاڵی نەچێژیت.

دەڵێن دووپیاو هاوڕێی یەکتر دەبن، پێکەوە دەژیان، یەکێکیان نابینایەو ئەوی تریان نەخۆشی ئێسکە نەرمەی لەگەڵدایەو ناتوانێت بڕوات، لەسەر ئەو بارودۆخە گوزەریان دەکرد، ڕۆژێکیان برسێتی زۆری بۆ هێنان، بەڵام هیچ لایەکیان توانای ئامادەکردنی خواردنیان نەبوو، پیاوە نابیناکە بڕیاری دا بچێت بۆ ڕاو، بەڵکو نێچیرێکی دەستبکەوێت، بەڵام کە بیری کردەوە، وتی: چۆن بچم من نابینام! بە هاوڕێکەی گوت: وەرە ئەتخەمە سەر کۆڵم، تۆ ناتوانیت بڕۆیت منیش نابینام، تەنها تۆ ئاگادارم بکەوە لە ڕاست و چەپ، تا شتێك ڕاوبکەین.

بۆیە لە کاتی گەڕانیان بۆ نێچیرێك بینیان ئاسکێکی بچوك قاچی شکاوەو ناتوانێت بڕوات و خۆی ڕزگار بکات، توانیان بیگرن و بیکەنە خۆراکی ئەو ژەمەیان، ئەو پیاوەی کە ناتوانێت بڕوات مارێکی بینی خەریك بوونزیك دەبووەوە لە هاوڕێکەی، بەردێکی پیاکێشا مارەکە تۆپی، هەر بۆیە تووشی دوودڵی بوو، وتی هاوڕێکەم چاوی نییە باشتر وایە بە تەنها ئاسکەکە بخۆم، ئەم مارەش بۆ هاوڕێکەم ببرژێنم! بۆیە نییەتی خۆی جێبەجێکرد. مارەکەی برژاند دای بە هاوڕێ نابیناکەی، خۆشی گۆشتی ئاسکەکەی خوارد، پیاوە نابیناکە تێری خوارد، تەنها چەوری مارەکە بەدەستییەوە مابوو هێنای بەدەموچاویدا چاوەکانی چاك بووەوە، بە ڕۆنی مارەکە!! هاوڕێکەی زۆر سەرسام بوو، باوەڕی نەدەکرد چاوی چاك بۆتەوە، کابرا نابیناکە کاتێك بینی کلکی مارەکەو چەرمەکە بەدەستییەوە ماوە، سەری مارەکەش لە تەنشتییەوەیەتی، سەیری هاوڕێکەی کرد کە ئەو کارەی لەگەڵ کردووە زۆر توڕەبوو، وتی: ئەمە کۆتایی هاوڕێیەتیمانە، ویستت بمکوژی؟! لە توڕەیی و دلگرانی خۆیدا لقی دارێکی بڕییەوە بەتوندی کێشای بە قاچی هاوڕێکەیدا، ئەویش لە ترسا کەوتە ڕۆیشتن! هەردوو هاوڕێکە چاکبوونەوە بە ناتەواوی ڕۆیشتن، بەڵام بەسەلامەتی گەڕانەوە! زۆر ڕاستە وتراوە ((ضار عاجل، نفعا أجلا)). لەم چیرۆکەوە بۆمان دەردەکەوێت:

کە لە دوای ئەو نارەحەتی و کەمئەندامیانەوە، هەریەکەیان بەشتێك خودا شیفایی پێبەخشین. بێگومان گەر مرۆڤ لە کاتی ڕوودانی هەر کێشەیەکدا پشت بەخودا ببەستێت، کاری ئاسان دەبێت.

# چۆن تەرکیزت بەهێز دەکەیت؟



زنجیرەی یەك

ئارام ستار بادلی

تەرکیز واتا تەنیا بە ئاگایی‌و سەرنجدانی تەواوەتی لەهەر شتێك بە بێ ڕوودانی بیربڵاوی، کاتێك گرنگی بەو شتە دەدەین خۆڕسکانە ئەو سەرنجدان‌و وریاییە بەدەستدێنین. شتێك نییە بە ناوی وریاو ئاگادارنەبوون، ئەو کەسەی بایەخ بە تەواوکردن‌و بەدەستهێنانی ئەو کارە نەدات کە چاوەڕوانیەتی وریایی لە دەستداوە، لە شتێکی دیکەدا بەکاریهێناوە‌و گرنگی بەشتو کارێك دەدات کە هیچ پەیوەندییەکی بە کارەکەیەوە نییە، دڵنیابە لە کارەکەتدا سەرکەوتوو نابیت ئەگەر هاتوو ئەو کارە نەتوانێت گرنگیدان‌و سەرنجت بۆ خۆی کێشبکات.

(جیستر)دەڵێت: «بێگومان ئەوە نیشانەیەکی‌تایبەتی‌بلیمەتی‌وسەرکەوتووییە کە دەتوانین وریایی‌و سەرنج‌و تەرکیزکردن بۆ بابەتێکی دیاریکراو بەهێز بکەین»، واتا تەرکیز بە مانای کەمکردنەوەی هۆکارەکانی بیربڵاوی دێت، بە دەربڕینێکی تر ئەو توانایەیە کە دەگونجێت بکرێتە خوو لە بەجێهێنانی کاروبارەکان، گرنگییەکی زۆری هەیە، چونکە هەموو توانا شاراوەکانی مرۆڤ دەتوانرێت بدۆزرێتەوەو پەروەردە بکرێت‌و بگەیەنرێتە لوتکە.

کەواتە هەموو مرۆڤێك دەتوانێت تەرکیزی بیر لە خۆیدا پەروەردە بکات‌و گەشەیان پێ بدات، بۆ نموونە ئەگەر کلیلێك ماوەیەك بەکارنەهێنین ژەنگ دەگرێت، بەڵام بە هۆی بەکارهێنانی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ جوانتر دەبێت، تواناکانی ئێمەش وەك ئەم کلیلەوانە دەبێت بە کاریان بێنین، ئەگەرنا ژەنگ هەڵدێنن، بۆ نموونە ئەنجامدانی ڕاهێنانێك بۆ ماوەیەك لە یەك کاتی دیاریکراودا بیر لە بابەتێك بکەرەوەو هەوڵ بدەن هەموو بیروتەرکیزتان بەم لاولادا نەڕوات، لەوانەیە سەرەتا بیرتان پرشوو بڵاوبێتەوە، بەڵام دواتر پێچەوانە دەبێتەوە، بە تێپەڕبوونی کات‌و بەردەوامبوون لەسەر ڕاهێنانەکە، بەڵام دەبێت حەزوئارەزووی لەگەڵدا بێت، چونکە حەزی زۆرتر= تەرکیزی زۆرتر= بیرهێنانەوەی زەینی باشتر= لەبەرکردنی باشتر= بیرهێنانەوەی خێراتر.

چونکە وەکو دەزانین بیربڵاوی شتێك نییە جگە لە خواستی زاتی مێشك بۆ چالاکی‌و ڤاڵبوونەوە، ئەم ڕێگایانە تەرکیز زیاد دەکەن:

١- خێرا خوێندنەوە: واتا کاتێك مرۆڤ بە هێواشی بابەتێك دەخوێنێتەوە، سەرەنجام مێشك لە بێدەنگی ماندوو دەبێت، بۆیە بیر لە یەك دەترازێت‌و بۆ لایەکی تر دەڕوات، بەڵام ئەگەر کەمێك بەخێرایی نەك زۆریش ئەوا هیچ بوارێك بۆ بیربڵاوی نامێنێتەوەو تێگەیشتنی زەین‌وهۆش کەمتر دەبێت.

٢-خوێندنەوەی سەرەتایی: واتا وەرگرتنی زانیارییە سەرەتاییەکان لە بارەی ئەو بابەتەی کە دەیخوێنیتەوە، بۆئەوەی بزانرێت ئایا ئەم بابەتە باسی چی دەکات؟

٣- پرسیارکردن: واتا بیرتان بێت پێش خوێندنەوەی بابەتەکە یەك، یان دوو پرسیار لە مێشکی خۆتاندا بکەن‌و بە بەردەوامی پرسیار لە خۆتان بکەن، چونکە پرسیار لە خۆکردن ڕێگایەکی زۆر گرنگ‌و بەسوودە بۆ دروستکردنی تەرکیزێکی زۆر کاریگەر.

٤- نووسینی بابەتەکە: واتا هەموو کاتێك پێویستە مرۆڤ پێنووسێکی پێبێت بۆ تۆمارکردنی ئەو شتانەی کەدەیانخوێنێتەوە، یان بۆی باسدەکرێن، چونکە یادگە(زاکیرە) هاندەدات‌و دەیبزوێنێت بۆ بە بیرهاتنەوەو تێگەیشتن لە بابەتەکەو لابردنی گومانی مێشك.

٥- بیرهێنانەوەی نووسینەکان: واتا کاتێك سەیری نووسینەکانی خۆتان دەکەن هەموو شتێکتان بەبیردێتەوە.

بە هۆی ئەم ڕێگایانەوە، هەم کاتەکانتان لە بەفیڕۆچوون دەپارێزرێت، سات بەساتیش بە حەزوتەرکیزێکی باشتر دەخوێنن، لە ئاکامدا دووردەبن لە پەتای لە بیرچوونەوەو سکاڵاکردن لە بێ تەرکیزی.

مەهدی حەمەسەعید

# ئاستی کەسایەتی‌و نیشانەکانی لە نێوان مرۆڤەکاندا...



کەسایەتی کۆمەڵە سیفەتێکی جەستەیی‌و دەروونی‌و کردەییە، بەشێوەیەکی بۆ ماوەیی‌و بەدەستهێنراو لەگەڵ خوونەریت‌و لاسایی‌و سۆزی کاریگەرەوە لە لایەن کەسایەتییەکانەوە دەردەکەوێت. زانست ئەوەی سەلماندووە کە هەر مرۆڤێك ئاستی کەسایەتی لە ٨٠٪ی بە هەوڵ‌و کۆششی خۆی دەتوانێت بە دەستی بهێنێت، ئەو بیستەی تریشی بە شێوەیەکی بۆماوەیی لە نێوان مرۆڤەکاندا دەمێنێتەوە. کەسایەتی لە ئەنجامی مامەڵەکردن لە نێوان کەسەکاندا لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا دەردەکەوێت. ئەمەش چەند بەشێکی هەیە لەوانە:

١- ڕووداوەکان دروست دەکات‌و دەیجوڵێنێت.

٢- سەیری ڕووداوەکان دەکات‌و قسەی لەسەر دەکات.

٣- بەسەرسوڕمانەوە پرسیار دەکات کە چی ڕووی داوە.

## کەسایەتی لەچی پێکدێت؟

ئەمەش چەند بوارو لایەنێك دەگرێتەوە کە ئەمانەن:

١- بواری جەستەیی: ئەمەش پێکهاتەی جەستە دەگرێتەوە لە بواری چۆنییەتی لاشەو دەمارو ئەندامەکان‌و نەخۆشکەوتن.

٢- بواری ژیری: ئەمەش لایەنی هەستکردن‌و زانین‌و بیرکردنەوەو نمایشکردن دەگرێتەوە.

٣- بواری ئارەزوو: لایەنی خۆشەویستی‌و سۆزو هەست‌و جۆشخواردن دەگرێتەوە.

٤- بواری ڕەفتارو هەڵسوکەوتکردن: خوونەریت‌و چۆنییەتی هەڵسوکەوتکردن کە بە دەستی دەهێنێت.

٥- بواری ژینگە: وەك هۆکارە سروشتییەکان‌و کۆمەڵایەتییەکان، وەك خێزان‌و کۆمەڵگاو قوتابخانە.

## تەنگو چەڵەمەکانی کەسایەتییەکان:

١- نامۆیی ڕێگەی بیرکردنەوەی لە خودی خۆی‌و خەڵکدا سەبارەت بەو ڕووداوانەی لە دەوروبەری ڕوو دەدەن، لە ڕێگەی چارەسەرکردنی‌و ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ ڕووداوەکاندا.

٢- پەیوەست نەبوون بە هەست‌و سۆزی تەنگژەیی کەم‌و زیاد دەکات.

٣- دڵەڕاوکێ‌و زاڵنەبوون بەسەر خودداو تێگەیشتنی پێویستییەکانی‌و ئەرکەکانی لە بەرامبەر بە پێویستییەکانی ئەوانی تردا.

٤- دڵەڕاوکێ لە مامەڵەکردن لەگەڵ دەوروبەریدا، لە بینینی نیشانەکانی کەسایەتیدا. وەك گومانی زۆر، ڕەشبینی زۆر، نەخۆشی حەساسیەت.. هتد.

## تواناکانی مرۆڤ:

هەموو مرۆڤەکان توانایان بەسەر دوو شتدا هەیە:

١- توانای گۆڕانی خود.

٢- توانای گۆڕینی بەرامبەر.

## نیشانەی کەسایەتی سەرکەوتوو بەم تایبەتیانەدا دەناسرێتەوە:

١- کارکردن بۆ چەند کاتژمێرێکی درێژو بەردەوام.

٢- پاراستنی کاتی مەوعید، بە وردی توانای جێبەجێکردنی هەبێت بەسەریدا.

٣- متمانە بە خۆبوون لە هەموو هەنگاو هەڵوێستەکاندا.

٤- گەشبینی‌و بوێری لە ئەنجامدانی کاردا.

٥- پاراستنی دان بە خۆداگرتن‌و داننان بە خود، لە هەڵوێستە ناڕەحەتییەکاندا.

٦- پێکهاتەی جەستەیی.

٧- دیاردەی دەرەوە کە پەیوەندی بە شوێن‌و ژینگەو دەوروبەرییەوە هەیە.

٨- توانای دڵنیاییکرن.

٩- هێزی دەستپێشخەری‌و ئازایەتی‌و ڕووبەڕووبوونەوە.

١٠- ڕاکێشانی خود، ڕاکێشانی زانستی کە توانای بەسەر چارەسەرکردنی کێشەکاندا هەیە. توانای فێرکردنی هەیە بە شێوەیەکی سادە.

## چی بکەین تا سەرنجی بەرامبەر بۆ خۆمان ڕابکێشین؟

ئەمەش بە ئەنجامدانی چەند کارێکی باش لە کاتی مامەڵەکردن لەگەڵ کەسانی دەوروبەردا:

١- سڵاوکردن.

٢- تەوقەکردن.

٣- ناوهێنان لە کاتی یەکتر بینیندا.

٤- گوێگرتن‌و بێدەنگ بوون لە ئاستی قسەکردنی بەرامبەر.

٥- گرنگیدان بەو وتانەی کە دەیڵێت.

٦- سوودگەیاندن بە بەرامبەرو هاوکاریکردنی بە لابردنی خەم‌و ئازارەکانی‌و هاوخەم‌و هاوخۆشی بەرامبەر بێت.

٨- وتەی سوپاسکردن‌و نرخاندنی لە بەرامبەر هەڵوێست‌و کارەکانیدا.

٩- پۆزش هێنانەوە لە هەر هەڵەو قسەیەك لە بەرامبەر کەسانی تردا.

شیرین نەجمەدین صدیق

# یەکەم بەردی بناغەی کۆشکە گەورەکان کێ دایدەنێت؟

گەر لاپەڕەکانی مێژوو هەڵدەینەوە بە ئێستاشەوە لە هەموو دونیادا بە بێ جیاوازی لە نێو کۆمەڵگاکاندا هەموویان بە یەك دەنگ ڕاستییەك دەڵێنەوەو ڕۆڵێك دەنرخێنن، یەکەم وەستای تێکڕای کۆشكو شارستانییە گەورەکان، بیروباوەڕی ئاینییەکان، سەرکەوتنی هەموو بیرو ئایدۆلۆژیاکان دیاری دەکەن، تۆ بڵێی ئەو کەسە کێ بێت؟ ناوی چی بێت؟

کام لەم پیاوانەی مێژوو شانازی بەو وەستا کارامەوە ناکات؟ ئەو ڕاستییە دوپات ناکاتەوە کە ئەو کەسە ناوی دایکە، ئەوە دایکێتی کە یەکەم تۆوی ئەو سەرکەوتنەی تیا چاندووە!

دایك وەك مامۆستا، وەك خەمخۆری ئوممەت، وەك شۆڕشگێڕ، وەك بزوێنەری ڕابوونو ئایدۆلۆژیاکان، وەك داینەمۆی ڕووناك کردنەوەی هەموو ژیان هاتۆتە مەیدان، نازانم ڕۆڵی ئەم هورنەرمەندە گەورە چۆن بنرخێنین لە کوێوە دەست پێ بکەین؟!

بەڵگەکان زۆرن بۆسەلماندن، واقعیش ڕۆژانە شایەتی ئەم ڕاستییە دەدات!

خەمی دایکی (خاتوو مریەم) بۆ گەلەکەی کە لە زەلکاوی دوودڵیو نەزانیدا دەتلانەوە، ئەم دایکە ئارامی لێ هەڵدەگیرێت، ئەم خەمە گەورەیە دەیباتە خەڵوەتگەوە، لەوێدا لەگەڵ پەروەردگاریدا پەیمانێك مۆردەکاتو نەوەیەکی لێ داوادەکات کە بە یارمەتی پەروەردگاری ئەم نەوە پەروەردە بکاتو کێشەی گەلەکەی چارەسەر بکات، بە قەدەر گەورەی خەم، ئیرادەی خودا وەڵامی دەداتەوە لە جیاتی نەوەیەك دووانی پێ دەدات (مریەمو عیسی)، نەك تەنها ڕزگارییان بۆ گەلەکەیان هێنا، بەڵکو پشکی شێریشیان بەردەکەوێت لە ڕزگارکردنی ئوممەتەکەی (پێغەمبەر محەممەد) (صلی الله علیه وسلم)، لە پاشەڕۆژدا دەبینی ئیرادەو هێزی دایکێك چۆن ئاسمان دێنێتە وەڵامو بە پانتایی زەویدا بڵاودەبێتەوە؟؟

دیارە خەمی ڕووناککردنەوەی هەموو جیهان لە دڵی دایکی ئەدیسۆندا داگیرساوە، بۆیە چاوی ئارامیو گەشبینی دەبڕێتە کوڕەکەی کە بەڕای مامۆستاکانی کوڕەکەی قوتابییەکی تەممەڵە، بەڵام هێزی ڕووناکی دڵی ئەم دایکە لە هەموو مامۆستاکانی ئەدیسۆن گەورترە، ئەم هێزەیە دێتە ناو ژیری منداڵەکەییو لەوێوە لەسەر دەستەکانی ئەدیسۆن یەکەم گلۆپ بۆ هەموو جیهان دادەگیرسێنێت.

دەگێڕنەوە کە دایکی (محەممەد فاتیح) هەموو ڕۆژێك کوڕە کۆرپەکەی دەباتە سەر کەناری دەریاو لەوێوە شاری (قوستەنتینیە)ی پیشان دەداتو دەچرپێنێ بە گوێی کوڕەکەیدا پێی دەڵێت: کوڕم دەبێت تۆ ئەو شارە ڕزگار بکەیت! ئەم بانگەشە شۆڕشگێڕییە وردە وردە لەگەڵ گەورەبوونی کوڕەکەیدا بە وێنەی چیاکان لە ناخیدا دەچەسپێت، دواتر گڕی نەکوژاوەی دەروونی دایکی دێتە مەیدان، سەرەنجام (محەممەد فاتیح) لە تەمەنی بیست ساڵیدا ئەو شارە لە دەستی خاچەکان ڕزگار دەکات.

هەستی ناسكو خۆشەویستی بێ مەرجی دایکێك وا لە ئەدیبی بەناوبانگی ئینگلیز (شکسپیر) دەکات کە ڕۆمانی بەناوبانگی جیهانی (دایك) بنووسێت، بە ڕاشکاوانە بە هەموو جیهان بڵێت: هێزی خۆشەویستیو خۆبەختکردن لە دایکدا هیچ وێنای نییە.

زاناو بیریاری گەورە (سید قوتب) ڕۆڵی دایکی بەم جۆرە دەنرخێنێت، دەڵێت: دایکم بوو توانی هەر لە منداڵییەوە من وەك پیاوە گەورەکان گەورە بکات، هەمیشە هانی دەدام لە کۆڕی پیاوە گەورەکاندا دابنیشم، دڵی گەورەی ئەم دایکە بوو بیروبۆچوونە گەورەکانی مامۆستای تەقاندەوەو هەموو جیهانی لەگەڵ خۆیدا هەژاند.

(شێخ عەبدولقادری گەیلانی)، پێشەوا (شافیعی) کە هەر لە منداڵییەوە بە هاوکاریو یارمەتی دایکییان، ئەو هەموو سەرکەوتنە مەزنانەیان تۆمار کردووە.

هەموو ئەم ئەکتەرە بەناوبانگانە کە سەربازی نەناسراوانو بە نهێنی ڕۆڵ دەگێڕن، هەموویان یەك دەوردەبیننو یەك ناویشیان هەیە، ئەویش ناوی دایکە.

ڕەنگە ڕۆڵەکانی تر لە ژیاندا کەسێك، یان دامو دەزگاکان بتوانن بیبینن، بەڵام ڕۆڵی دایك هیچ هاوتایەکی نییە، هیچ کەسێکیش ناتوانێت بیبینێت، جگە لە دایك، بۆیە دایکی خۆشەویست پێت دەڵێین:

١- هەمیشە هیواو ئاواتی گەورە لە منداڵەکەتدا بچێنە، بە بەردەوامی لەگەڵیدا دووبارەی بکەرەوە.

٢- بۆ کاری بچووکو سنوردار منداڵ مەخەرەوە، با بە هیوای چارەسەرکردنی کێشەو گرفتەگەورەکانی ژیان، سەرکەوتنە مەزنەکانەوە لە دایك بن.

٣- لە خزمەتی پەروەردگاردا زۆر بپارێرەوە، بە دڵسۆزییەوە داواو نییەت پاکی خۆت دەربخە، ئەو نزایانەی کە بە زمانی پێغەمبەرانەوە هاتوون بۆ نەوەکانیان، چۆنێتی داواکردنیان لە قورئاندا هەیەو لە بەریان بکەو بە بەردەوامی دووپاتی بکەرەوە.

٤- زۆر ئارام بگرە لە کاتی پەروەردەکردنییدا، هیچ کات بێ هیوا مەبە، بەردەوام بە لە ناشتنی وشەی سەرکەوتن لە ناخیدا.

دایکی ئازیز، هیچ کەس ناتوانێت ئەم ڕۆڵەی تۆ بگێڕێت، بۆیە دایکایەتی گەورەترین مەدالیای شانازیتە، دەتوانیت بیخەیتەگەڕ بۆ هەر مەبەستێك خۆت بتەوێت!

ئالانی



# سوودەکانی شیلك

شیلك ڕووەکێکی باوو ناسراوەو لە خێزانی گوڵە، لە دێر زەمانەوە پزیشکی ئیغریقی (تیوفراتوس) سوودو بەهاو نرخی شیلکی ئاشکرا کردووە..

شیلك دوو جۆرە: شیرینو ترش.

پێکهاتەی شیلك: شیلك دەوڵەمەندە بە خوێی کالسیۆم، ئاسن، ڕێژەی شەکری سروشتی، هەروەها ئەمجۆرە ڤیتامینانەشی لە خۆگرتووە: ڤیتامین (B)، (C)، (K).

سوودی شیلك:

میوەیەکی بە تامو بەسوودە، بۆ دروستکردنی شیرینیو شەربەتو گەلێك شتی دی بەکاردەهێنرێت، خاوەنی بەهایەکی خۆراکیو دەرمانی زۆر بەرزە، هەرسکردنی ئاسانە، تەنانەت خواردنی بۆ ئەو کەسانەش گونجاوە کە نەخۆشی گەدە (معدە)یان هەیە.

دیارترین سوودەکانی شیلك بۆ مرۆڤ:

١- شیلك بە سوودە بۆ چارەسەرکردنی کەمخوێنی.

٢- مرۆڤ لە نەخۆشی شێرپەنجە دەپارێزێت.

٣- دەبێتە هۆی چالاککردنو بەهێز بوونی مرۆڤ.

٤- شیلك بەسوودە بۆ نەخۆشییەکانی کۆئەندامی هەناسەدان، وەکو ڕەبۆو نەخۆشییەکانی سی.

٥- شیلك بە سوودە بۆ ئەو کەسانەی دووچاری نەخۆشی سیلو هەوکردنی جومگەکان بوون.

٦- یارمەتی کرداری هەرسکردن دەدات.

٧- ئازاری سوری مانگانە کەم دەکاتەوە.

٨- ددان سپیو جوان دەکات.

٩- شەربەتی شیلك میزکردن ئاسان دەکات، گەدە چالاك دەکات.

١٠- شەربەتی شیلك، خوێن پاك دەکاتەوە، بەکاردەهێنرێت بۆ خوێن بەربوونو پاککردنەوەی ڕووخسار.

جگە لەوانەش میوەیەکی بە تامەو پڕبەهای خۆراکییە.

تەنانەت گەڵای ئەم میوەیەش سوودی خۆی هەیە، گەڵاکانی سوودێکی زۆریان هەیە، گەڵای ئەم ڕووەکە لەگەڵ تۆوی شیلکدا دەکوڵێنرێت، بۆ چارەسەری ڕەوانی بەکاردەهێنرێت، ، هەروەها بۆ نەخۆشییەکانی جگەرو میزەڵانو گورچیلەش بەکاردەهێنرێت.

سەرەڕای هەموو ئەمانەش شیلك بۆ جوانکاری ڕووخساریش بەکاردەهێنرێت، چەند دانەیەك لە شیلك لە پێش نووستندا دەموچاوی پێ چەور دەکرێت، پاش لە خەو هەڵسان بە ئاوی مەعدەنووس دەشۆردرێت، ئەمەش دەبێتە هۆی چالاککردنو بەهێزکردنی پێستو لابردنی چرچو لۆچی دەموچاو، هەروەها بە ڕێگەیەکی دیکەش بۆ پاککردنەوەو جوانکردنی ڕووخسار بەکاردەهێنرێت، ئەویش پاڵفتەی شەربەتی پێنج دەنك شیلك لەگەڵ زەردێنەی هێلکەو پێنج دڵۆپ لە ئاوی گوڵو دە دڵۆپ لە جۆری گەتیرەی جاوە، هەموو ئەم شتانە تێکەڵ دەکرێتو دەخرێتە سەر پارچە قوماشێکی لۆکە، پاشان ئەم گیراوەیە بۆ ماوەی یەك کاتژمێر لەسەر دەموچاو دادەنرێت، دوای ئەوە لادەبرێتو بە ئاوێکی شلەتێن دەموچاوت دەشۆریت!

سوودی دیکەی شیلك:

بۆ سووتانەوەی خۆر بەکاردەهێنرێت، کە بە زۆری لە وەرزی هاویندا دووچاری ئافرەتان دەبێت، جا ئەو سووتانەوەیە لە ڕووخساردا بێت، یا لە سەر شاندا، پارچە قوماشێکی لۆکە لە شەربەتی شیلك هەڵدەکێشیتو لەسەر شوێنی سووتانەوەکەی دادەنێیت، کاریگەرییەکی بەهێزی هەیە بۆ گێڕانەوەی گەشیو جوانی ڕووخسار.

شیلكو ددان:

ئەو کەسانەی بە دەست زەردی ددانەکانەوە دەناڵێنن،پسپۆڕانئامۆژگارییان دەکەن بە خواردنەوەی شەربەتی شیلك، بە شێوەیەکی بەردەوام، ئەمەش دەبێتە هۆی جوانکردنو سپیکردنەوەی ددانەکان بە شێوەیەکی سەرنجڕاکێش.

شیلكو جوانکاری:

هەروەکو لە سەرەتادا ئاماژەمان بۆ کرد، شیلك ڕۆڵێکی بەرچاوی هەیە لە پاککردنەوەو لابردنی چرچولۆچی دەموچاودا، هەروەها بۆ چارەسەرکردنی ڕووخساری چەور بەکاردەهێنرێت، جگە لەوەش وەکو ماددەیەکی پاژکەرەوەو جوانکردنی ڕووخسار بەکاردەهێنرێت.

پەری شێخ کەریم



# خێزانو پشووی هاوین



دوای تەواوبوونو بەسەربردنی ڕۆژانو مانگەکانی خوێندنو سەرقاڵبوون بە تاقیکردنەوەو سەعیکردنو پاش ماندووبونێکی تەواو، مانگەکانی بێکاریو پشوو لە لای قوتابیانو خوێندکاران دەست پێدەکات، هاوکات ئەرکی خێزانیش دەستپێدەکات چ دایكو باوك، یا خوشكو برای گەورە، هەرکەس لە گەورەی خێزانەکە بەرپرسیارە لە پڕکردنەوەی ئەو بێکاریو بۆشاییەی کە قوتابی لەم پشووەدا ڕووبەڕووی دەبێتەوە.

بۆئەوەی منداڵ خۆی خەریك نەکات بە شتی لاوەکیو بێسوودەوە، پێویستە لەسەر ئەندامانی خێزان فێری ڕێزگرتنی کاتیان بکەنو بۆ بەسەربردنی کاتەکانیان بەرنامەڕێژییان بۆ بکەن، چونکە کات بەهرەیەکە مرۆڤەکان زۆر جار لێی بێئاگانو کاتێك وەبیریان دێتەوە لە دەستیان چووەو جارێکی تر ناگەڕێتەوە، هەروەك پێغەمبەری ئازیز (سەلامی خوای لێبێت) دەفەرموێت: ((نعمتان من نعم اللـه مغبون فیهما کثیر من الناس: الصحة والفراغ)).

واتە: (دووبەهرە لە بە هرەکانی خودا زۆرێك لە خەڵکی لێی بێئاگان: لەشساغیو بێکاری))، هەربۆیە کاتێك مرۆڤ لەشساغە، یا بێکارە، بۆشاییەك هەیە لە ژیانیدا نرخی ئەو دوو بەهرەیە نازانێت.

منداڵ بە شێوەیەکی گشتی تا تەمەنی (١٠) ساڵی زۆرکات بۆشایی خۆی بە یاریکردن، یا دانیشتنی زۆر بەرامبەر تەلەفزیۆن بۆ تەماشاکردنی فیلم کارتۆنی ترسناكو بێسوود بەسەر دەبات، ئەمەی دووەمیان لە ڕووی دەروونییەوە کاریگەری خراپی هەیە.

پشووی هاوینی بێئامانجو بەرنامە کۆتایی دێت، بێئەوەی نەوەکانمان هیچ سوودێکیان وەرگرتبێت، لەبەرئەوە پێوستە دایكو باوکی یارمەتی نەوەکانیان بدەنو کاتەکانیان بۆ دابەش بکەن بەسەر بەرنامەی باشدا، ئەگەر خۆیان نەیانتوانی هەڵسن بەم کارە، بەڵام بە پێچەوانەوە بایەخنەدان پێیان کێشەو دڵەڕاوکێو گرفت بۆ خێزان دەنێتەوە، هەروەك دەبینین کوڕان لە دوای تەواوبوونی خوێندنگا سەرشەقامو مارکێتەکان بۆتە پیشەیان، کچانیش سەیرکردنی فیلمە دۆبلاژکراوەکان بۆتە کاری شەوو ڕۆژیان، ئەمەش ئەنجامێکی خراپی لێدەکەوێتەوەو کاریگەری خراپی هەیە بۆ سەر خێزانو پاشان کۆمەڵگا بەشێوەیەکی گشتی، کوڕان چەندەها کاتژمێر دوور لە بەر پرسیارێتیو دوورلە ئادابو نەریتی خێزان ژیان بەسەرببەن، ئایا چ داهاتوویەك چاوەڕوانی خێزانو کۆمەڵگا دەکات؟

بە تایبەتی کۆبوونەوەی چەندەها گەنج لە کوچەو کۆڵانەکاندا چ سوودێکی دەبێت؟

چونکە پێغەمبەری ئازیزمان دەفەرموێت: (هاوڕێی باش، وەکو گوڵاو فرۆش وایە، یا گوڵاو پرژێنت دەکات، یا گوڵاوی لێ دەکڕیت، هاوڕێی خراپیش وەکو ئاسنگەر، یا جلوبەرگەکانت دەسوتێنێت، یان بۆنێکی ناخۆشی لێوە دەکەیت)، کچانیش بۆ بەسەربردنی کاتەکانیان وەك باسمان لێوەکرد، ئایا ئەو فیلمو بەرنامە بێ بەهایانە چ بە کچان دەبەخشن جگە لە زیانو نائاسوودەیی بۆ ژیانی ڕۆژانەیان؟!

لەم ژمارەیەدا بە کورتی باسی ئەو بەرنامانە دەکەین کە پێویستە لە سەر خێزانەکان دایبرێژن بۆ نەوەکانیان، پاشان ئەو ئامانجانەی کە نەیانتوانیوە لە کاتی خوێندندا جێبەجێی بکەن، هەوڵبدەن لەم پشووەدا ئەنجام بدرێت:

لێرەدا ئامانجەکان دەکرێن بەسێ بەشەوە:

یەکەم: ئامانجی ئایینیو ئاکاری:

ئەمەش دەکرێت بە چەند خاڵێکەوە:

- ئەو ئامانجانەی کە دەتوانرێت لەم

پشـوودا جێبەجێ بکرێت، سـەرەتا هەوڵ بدرێت منداڵ فێری نوێژ بکرێتو کوڕان هان بدرێن بە کۆمـەڵ نوێژ بکەن لە مزگەوتو کچانیش لە ماڵەوە سەرپەرشتی بکرێن.

- قورئـان خوێنـدنو لەبەرکردنـی، پێوسـتە لەسـەر دایکانو باوکان تەنانەت ئەگەر ڕۆژانە دوو ئایەتیش بێت، یا زیاتر ماڵەکەیـان بە قورئان ئـاوەدان بکەنەوە، هـەروەك پێغەمبـەر (سـەلامی خـوای لێبێـت)، ((إن الذی لیس فی جوفه شـیء من القـرآن کالبیـت الخرب))، بەڕاسـتی ماڵێـك دوور بێت لە قورئـانو یادی خوا بێگومان دەشـێت خێـرو بەرەکەت ڕووی تێنـەکات، لـە هەمـان کاتـدا پێویسـتە هۆکاری هاندان بەکاربهێنرێت، وەك دیاری کڕیـن، یا بەشـداریکردنی لـە کارێك، یا شوێنێك ئارەزووی لێیەتی، ئەمەش کارێکی گەورەیـە بۆ نەوەکانمـان کە دەتوانین بە هۆیـەوە لە کاری هەڵـەو هاوڕێی خراپ دووریان بخەینەوەو پاشـان کاتەکانیان لە کاری باشەدا بەسەر ببەن.

- فەرموودە لەبەرکردن، یاخێرکردن، یا چاکە کردن لەگەڵ ئەندامانی خێزانەکەدا، یا کەسـانی دەوروبەر، منداڵ پێوستە هەر لەسـەرەتای ژیانییەوە فێری ئادابو وتەو کردارەکانـی پێغەمبـەر (سـڵاوی خوای لێبێـت) بکرێت، سـەرەتا بـە فەرموودە ئاسـانو کورتەکان دەسـپێبکرێت، پاشان هاندانی لەسـەر خێرکردن، منداڵ فێری ڕێزگرتنی ئـەو نیعمەتانە دەکات کە پێی بەخشـراوە، چ پارە بێت، یـا جلوبەرگ، کاتێـك بە دەسـتی خـۆی دەیبەخشـێت بە کەسـانی هـەژارو سـۆزو بەزەیی لەلا دروسـت دەبێت بەرامبەر ئەو کەسـانەو سـادەیی لە ڕەوشـتیدا دروسـت دەبێت، چاکەکـردن ئاواتی هەموو دایكو باوکێکە کـە منداڵەکەی چاکە خوازبێـت، کەواتە کاری چاکە بکـە هەتا فێری چاکە ببێت، وێڕای سـەردانی خزموکەس بـە تایبەت باوەگەورەو دایە گەورە.

**دووەم: ئامانجـی گەشـەپێدانی هۆشیاریو ڕۆشنبیری:** کە دەتوانرێت لەم پشـوودا جێبەجێبکرێـتو بەرنامەی بۆ داڕێژێت، کە ئەمەش ئامانجێکی لاشەییو دەروونییە، بۆ دەرخسـتنی تواناو زیرەکی منداڵو زیادکردنی زانستو ڕۆشنبیری لە بوارەجیاوازەکاندا، پاشـان بەسـەربردنی کاتێکی بەسـوود، هەوڵ بـدە بەرنامە بۆ ئەم کارانە دابنێ:

- بەشـداریکردنی لەو شـوێنانەی کە کتێبـی بە سـوودی تیادا دەفرۆشـێت، تا ئەو منداڵە بە ویسـتی خۆی کتێبو شتی بەسوود هەڵبژێرێت.

- فێرکردنـی کۆمپیتـەر، ناردنی بۆ خولـی فێرکردن بـە تایبەتـی دڵنیابین لـەوەی ئایـا بەرنامـەو پرۆگرامـی ئەم خوولە چییە.

بایەخـدان بە ئارەزوو توانای منداڵ، زۆرێـك لە منداڵان حەز بە وێنەکێشـان، یا کاری دەسـت، یا لە نووسـینی شیعرو پەخشانو چیرۆك دەکەن، پێویستە لەسەر خێزان ئەو توانـاو ئارەزووەی زیاتر پەرە پێبدات لەم پشوودا.

**سێیەم: ئامانجی تەندروستی:** ئەمجۆرە وەك نەخۆشێك مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت، لەوانەیە بە هۆی خوێندنو سـەرقاڵبوون بـە تاقیکردنـەوە تووشـی جۆرێـك لـە ماندوبـوونو بێـزاری بووبێت، پێوسـتە لـەم پشـووی هاوینـەدا وەك شـێوازێکی تەندروسـتییانە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت، ئەمجۆرە نەخۆشـییە، یا دوای وەرگرتنی ئەنجامـی تاقیکردنەوەکان لە لای منداڵو قوتابیان دروست دەبێت، یا ئەو قوتابیانە بەردەوام نەخۆشن، یا ماندوون چ لە ڕووی جەسـتەیی، یادەروونییەوە، پێویستیان بە چارەسـەرکردن هەیە، ئەویـش بە دانانی بەرنامەیەك بـۆ حـەزو ئارەزووەکانیان، سـەرەتا ئامانجی دینـیو لاشـەیی تیادا جێبەجێبکرێت، پاشـان سەردانی کەسانو هاوڕێیانـی پێبکرێت تا ئـەو بێزارییەی لـە ناخیدایە نەمێنێت، ئەگـەر دەزانیت بە هۆی نمرەکانەوە تووشـی ئەم حاڵەتە بووە کەسـانی خوار خۆی بـۆ باس بکەو تانائومێدیو دوودڵی لـە بیروبۆچوونیدا نەمێنێت.

لـە کۆتاییـدا داواکاریـن لـە هەموو سـەنتەرە فێرخوازییـەکان لـە کاتـی کردنـەوەی هەر خولێکـدا پەیڕەوی ئەم خاڵانە بکەن:

* بەرنامـەو پرۆگرامێکـی جـوانو دڵسۆزانە ببەخشن بە قوتابیان، نەك تەنها پارە وەرگرتن!

* نرخێك دابنرێت بۆ خوولی فێرکردن لەگەڵ ئاستی هەمووانداا بگونجێت.

* بایەخدان بە ڕۆشـنبیری کوردیو کەلتوریو بەهـا ئایینـیو کۆمەڵایەتییە خۆماڵییەکان، نەك ڕۆشنبیری بیانی.

داواکارم لـە خـودای مـەزن هەمووخێزانـەکان سـەرکەوتوو بکات، بۆ بەسەر بردنی پشوویەکی خۆش.




**ژیان فێری کردم:** لە بری گوفتاری زۆر، کـردەوەی زۆر ئەنجام بـدەم، چونکە ئەو کەسەی گوفتاری زۆرە، کرداری کەمە.

**ژیان فێری کردم:** دڵم نەبەخشـم بەو کەسەی خۆشـم دەوێت، بەڵکو بیبەخشم بەو کەسەی خۆشی دەوێم!

**ژیان فێـری کـردم:** وەکو ئەسـتێرە وابـم، کـە هەمیشـە بێـدارە بۆئـەوەی، ئاسـۆی کەسـانی تـر ڕوونـاك بکاتەوەو ژیانوگوزەرانیـان ڕازاوە بکات، بەبێئەوەی چـاوەڕێ بکات، کـە کێ بـۆی دەڕوانێت، یاخود کەسێك پێی بڵێت: سوپاس!

**ژیـان فێـری کردم:** سـەرەتا بـە دوای خۆمدا بگەڕێمو لە خۆم تێبگەم، پاشـان بە دوای کەسانی دیدا بگەڕێمو لێیان تێ بگەم.

**ژیـان فێـری کـردم:** مـرۆڤ چەندە جوانـە، کاتێـك ئـازاری دەگاتو قسـە نـاکات، دەگریو هاوار نـاکات، مەرج نییە هەمـوو ئەو مرۆڤانەی لێـو بە خەندەن، بەختەوەرو شـادمان بن، چونکە لە پشت هەمـوو زەردەخەنەیەکـەوە، ئازارێکـی بەهێزو جەرگبڕ هەیە!

**ژیان فێری کردم:** چوار شـت هەرگیز ناگەڕێنەوە:

ئەو بەردەی فڕێی ئەدەیت ناگەڕێتەوە، ئەو قسـەیەی دەیکەیت، ناگەڕێتەوە، ئەو هەلەی لە دەسـتت دەچێـت ناگەڕێتەوە، هەرگیـز لاوێتیو ئـەو کاتەی بەسـەرت بردووە، ناگەڕێنەوە!

**ژیـان فێـری کـردم:** هاوڕێیەتـی وەکو پەرتـووك وایـە، تەنها پێویستی بە چەند چرکەیەك هەیە بۆ سووتاندنی، بەڵام پێویستی بە چەند ساڵێك هەیە بۆ نووسینەوەی!

**ژیـان فێری کردم:** هـاوڕێ کۆنەکانت وەکو ئاڵتوون وان، هاوڕێ تازەکانیش وەکو ئەڵماس، ئەگەر ئەڵماسـت بە دەسـتهێنا، ئاڵتوونت لە بیر نەچێت، چونکە تەنانەت هەڵگرتنی پارچەیەك ئەڵماسیش، پێویستی بە بناغەیەکی ئاڵتوون هەیە..

کەریم سمکۆ



# دژی کاری خودا مەبە!

هەمیشە ڕازی نەبوون بە کاری خودا، ناخۆشی بەدوادا دێتو دواتریش پەشیمانی هیچ دادێکی نییە، یەکێك لەو دیاردانەش کە تاك بەرامبەر بە کاری خودا پێی ڕازی نییە لە باربردنی منداڵە، ئەمەش جگە لەوەی لە ڕووی ئاینی پیرۆزی ئیسلامەوە کارێکی حەرامەو بە کوشتن دادەنرێت، لە هەمانکاتیشدا کوشتنی مرۆڤێکی ئاساییەو لە ڕووی مرۆڤایەتییەوە کارێکی قێزەونو نامرۆڤانەیە!

ئەم دیاردەیە زەنگێکی مەترسیدارە لە نێو هەموو کۆمەڵگاکانی جیهان، ئەم دیاردەیە ئێستا لە کوردستانیشدا ڕووی لە زیادبوونە، هەریەکێکیشیان بە هۆکاری جیاجیا بەمکارە هەڵدەستنو منداڵەکەیان کە بەرهەمی جەرگیانە لەباردەبەن..

کاتێك کامیار لەسەر کارەکەی گەڕایەوە، بە دڵێکی شادەوە ئۆتۆمبێلەکەی لێدەخوڕی، لەسەری کوچەی ماڵەکەیان وەك پیشەی هەمیشەیی ئۆتۆمبێلەکەی ڕاگرتو دوو چپسو چەند بسکویتێکی بۆ دیارو ژیلەی منداڵە چاوگەشەکانی بردەوە ماڵەوە، بەڵام لەگەڵ گەیشتنی بۆ بەردەم دەرگای ماڵەوەیان گوێی لە دەنگی ڕشانەوەی هاوسەرەکەی دەبێت، ڕاستەوخۆ گەیشتە سەرسەری هاوسەرەکەیو پێیگوت: "لانەگیان چیتە سەلامەتی؟" ئەویش بە هێدییەوە چاوەکانی لێکنان، وەك ئاماژەدان بە چاکبوونی باری تەندروستی.

دوای ئەوەی چوونەوە ژوورەوە، کامیار لەگەڵ منداڵەکانی خەریکی خواردنی چپسو بسکویتەکان بوو، دوایی لانەش بانگی کردن بۆ نانخواردن، بەڵام خۆی چووەسەرکار، بەبیانووی ئەوەی پێشتر نانی خواردووە، شەوانە هەمیشە کامیار بە لانەی دەگوت دەبێت ئایندەی خۆمان دیاری بکەینو ژیانمان تەرخان بکەین بۆ پێگەیاندنی ئەم دوو منداڵەمان، هەردەم ژیان بە کوڕو کچێکەوە خۆشە، ئێمە منداڵی ترمان ناوێت، ئەو هەمیشە پێداگری دەکرد لەسەر ئەوەی دەبێت لانە دەرمانی دژە سکپڕی بەکاربهێنێت، بۆ ئەوەی نەبادا منداڵی دیکەی ببێت.

کامیار جگە لەوەی کارمەندی میری بوو لە هەمان کاتیشدا کاری بازرگانیشی دەکرد، واتا بژێوی ژیانیان باش بوو، ئیدی ئەو نەخۆشییەی لانە درێژەی کێشا، تا ڕۆژێك کامیار گوتی: دەبێت سەردانی پزیشك بکەین، کاتێك کاغەزی پشکنین دەگەڕێنەوە لای پزیشکی پسپۆر، لانە دڵی خێراتر لێدەدا، کاتێك پزیشکەکە دەم دەکاتەوە، لانە چاوەکانی دەنوقێنێت، چونکە دەیزانی هاوسەرەکەی کە قسەیەکی کرد دەبێت بیگەیەنێتەجێ، لەگەڵ وشەی پیرۆزە، فرمێسك لەچاوەکانی لانە زنجیرەی بەست، ئیدی لانە بە نیگەرانی لەگەڵ هاوسەرەکەی دەگەڕێتەوە ماڵەوە.

هەرچەندە کامیار لێی دەپرسێت کە پزیشکەکە چی پێگوت، بەڵام ئەو ناوێرێت ڕاستی مەسەلەکەی بۆ باس بکات، بەڵام دوای چەند ڕۆژێك ڕاستی بابەتەکە بەکامیار دەڵێت، بەڵام ئەوەی لانە چاوەڕێی نەدەکرد کامیار پێی گوت! دڵی لانە لە جاران زیاتر لێی دەدا، نەیدەزانی لە بەرانبەر ئەو بڕیارەی کامیاری هاوسەری چی بکات، هەرچەندە پێی دەگوت ئەمە بەخششی خودایە، بەڵام کامیار هەر پێداگری دەکرد کە منداڵەکە لەبار بەرێت، ئااااای ئەمە چ تاوانێکی گەورەیە، جەرگی خۆت بە دەستی خۆت بکوژیت!

زۆرێك لە خەڵکان هەن تەواوی سامانی دونیای خۆیان خەرج دەکەن بۆ دروستبوونی منداڵێك، بەڵام خوای گەورە پێی نەداون، فرمێسکی چاوەکانیان شەوانە بە بێدەگی باراند بۆ لە باوەشگرتنی جگەرگۆشەیەکی هەناوی خۆیان، بەڵام منداڵیان نەبووە، ئەی ئەوە چ کەسێکە منداڵی خۆی بە پارەیەکی زۆر لەبار دەبات؟

ئیدی کامیار گوتی: من پارەم هەیەو بڕۆ لەباری ببە، بە چەند بێت کێشە نییە، ئێمە منداڵی ترمان ناوێت، لانە بەچاوی تیژی پڕ لە حەسرەتەوەو بە دڵی داڕوخاوو جەستەی لەرزۆکەوە، بەرەو ماڵی ئەو پیرەژنە چوو کە کاری لەباربردنی منداڵ بوو، دوای ئەوەی بە پارەیەکی زۆرو بە ئازارێکی زۆرەوە، منداڵە چاوگەشەکەی لە هەناوی لانە دەرهێنا، لانەش وەك تەرمێکی بێگیان لەسەر دۆشەکەکە ڕاکشابوو، کاتژمێر سێی دوای نیوەڕۆ بوو، هێشتا زەنگیان بۆ کامیاری هاوسەری لانە لێنەدابوو، بۆئەوەی بێت بە دوای هاوسەرە داماوەکەیدا، کاتێك لانە کەمێك هاتەوە سەرخۆی زەنگیان بۆ کامیار لێدا، دووەمجار

زەنگەکەیـــان دووبارە کردەوە، ســێ جار، چوار، پێنج، بەڵام وەڵامێك نییە!

"توخـــوا ئەمـــە پیـــاوە، زەنگـــی هاوســـەرە داماوەکـــەی هەڵنەگرێـــت، بە تایبەتـــی کە لەم حاڵەدایە" ئەمە وتەی پیرێژنەکەو ئافرەتەکانی دەوروبەری بوو.

پیرێژنەکـــە بـــە منگـــە منگـــەوە هەڵیدایەو گوتـــی: "داخوا ئەو ڤورپەســـەرەش چـــۆن بووبێتە بارگرانی بەســـەر ئەو پیاوەوە، نانا داخوا ئێســـتە لە کوێ بێـــت!" لانە لە تاو ئازاری دامێنو هەناوی خۆی لە زیرەدابوو، هەموو لەشـــی دەلەرزی، وەکو شـــەنگەبی ناوئاو، لەگەڵ بیستنی ئەو بۆڵە بۆڵەش زێدەتـــر ئازاری دەگەیشـــت، بـــەڵام دوای ئەوەی بۆ جارێکی تـــر زەنگیان بۆ کامیـــار لێدایەوەو دایانە دەســـتی لانە، لەگەڵ بیســـتنی وەڵامەکـــەی کامیار، لانە پێـــش چاوەکانی تاریکبـــوونو لە هۆش خۆی چوو، هەموویان حەپەسان، دوای ئەوەی چاوەکانی هەڵهێنان پاشـــی دوو کاژێر لەســـەر قەرەوێڵەکەی نەخۆشـــخانەی شـــارەکەیان خۆی بینی، وایدەزانی ئەوەی پێش ئەو کات گوێبیستی ببوو خەونە، ئێستا دڵنیام خوازیارن بزانن کە ڕووداوەکە چییە، ئەوەی کـــەس بیـــری لێناکاتەوە ئەوەبوو کـــە دیاری کوڕە چوارساڵەکەی لانە بە ڕووداوی ئۆتۆمبێل خەڵتانی خوێن ببـــوو، کاتێك لەگـــەڵ مناڵەکانی گەڕەك لە پێـــش ماڵی داپیرەی یاری دەکـــرد! بەڵام بۆدواجار چاوەکانی لێکنانو ماڵئاوایی لە ژیان کرد.

کامیار بە چاوی پڕ فرمێسکەوە هاواری دەکردو دەیگـــوت: "بەدەســـتی خۆم کوڕە چاوگەشـــەکەم کوشت، من بووم کە ماڵەکەی خۆم وێران کرد، من تاوانبارم، من، من" دوای تەواوبوونی پرسەکەیان لە ماڵە چۆڵەوانییەکەیاندا درێژەیان بە ژیانیان دایەوە، لە پڕ ڕۆژێك ژیلەی چاوگەشیش تووشی نەخۆشـــی دەبێتو بە تاوەتـــاو دەیگەیەننە لای پزیشکی پســـپۆڕی منداڵان، دوای پشکنین بۆیان دەرکەوت کە ژیلە تووشی نەخۆشییەکی کوشندە بووە کە چارەسەرەکەی لە دەرەوەی وڵاتە، وەلێ ئەم هەلەشیان بۆ نەڕەخسا تاکو بیبەنە دەرەوەی وڵات، بۆیە ئەویش گیانی سپاردو کامیارو لانەی بە خەمو ئازێشە سپارد.

ئیدی لـــە باربردنی منداڵێکـــی بێتاوان بووە هۆکارگەلی ئەوەی ئەو تروســـکاییەی لە چاوەکانی دیـــارو ژیلە کە بە ماڵەکەیانی بەخشـــیبوو، بووە مۆرکێك لەســـەر دڵیان، چاکبوونەوەی مەحاڵبوو، ژیانێـــك کە هیوایەکی تێدابوو، بووە تاریکســـتانی نائومێـــدی، ماڵێك کـــە چاوگەشـــانێکی تێدابوون بـــوو بـــە کەلاوەیەکی بەتـــاڵ. ئەوەی ناخۆشـــتر لەو ئازارانەی بەســـەر ئەم ماڵەدا هاتو پێویســـتە بیزانین ئەوەیە ئێستا ئەوان پزیشکی پسپۆر نەماوە ســـەردانی نەکەن، بۆ ئـــەوەی منداڵێکی چاوگەش بەرهەبهێنن، بەڵام بۆیان مەیسەر نابێت!

ئیدی با هەمووان ئەم چیرۆکە بکەینە پەند بۆ ژیانمانو قەدری ئەو دیارییانە بزانین لە لایەن خـــوداوە پێمان دەبەخشـــرێت، نـــەوەك گرنگیان پێنەدەینو خۆمان بە گەورە بزانین بەرامبەریان، بە تایبەتی بوونی منداڵ لە ژیانی هاوسەریدا.

# کاتژمێر ٢٥

درەخشان بەهادین

لە ژیانـــدا وا ڕاهاتووین، یان ژیان ئێمەی وا ڕاهێناوە، کە بۆ هەر کارێك کاتێکی تایبەت دابنێین، کاتێك بۆ کارکردن، کاتێکی دیاریکراو بۆ پشـــوودانو گەشـــتو حەســـانەوە، کاتێکی تریش بـــۆ کڕینی پێداویســـتیو کاتێکیش بۆ نووستن.

ئێمە لەو کاتـــەوەی بووین بە کات ناسو نرخو ئەرزشی کاتمان بۆ دەرکەوتووە، گۆڕاوین بۆ پسپۆڕێکی دابەشکردنی کات. لەو ڕۆژەوە تا شـــەو چاومان لە کاتژمێـــرە، تا نەوەکو هەلو کاتی گونجاومان لە دەست بچێت.

لە ڕاستیدا ئێمە بۆ شتانێك کە دەمانەوێتو گرنگـــە بۆمان کات تەرخـــان دەکەین، بۆ ئەو شـــتو کارانەی کە لامان پەسەند نییەو جێی بایەخ پێدان نین، کات دانانێین، جوان سەرنج بدەن "ئەگەر شـــتێك لە ژیاندا گرنگ نەبێتو نەمانەوێت کاتی بۆ تەرخان ناکەین".

ئەمە ئەو بنەمـــا گرنگەیە کە مرۆڤەکان بـــە چاکـــی لێـــی ئـــاگادارن، کەواتـــە ئەگەر منداڵەکـــەت بـــە پاڕانەوە داوات لێـــدەکات تا کاتێکی زۆر لەگەڵیدا بمێنیتەوەو یاری بکەن، ئێوە بە بێتاقەتیو بێزارییەوە دەســـت دەنێن بە ڕوویەوەو دەڵێن: کاتمان نییە، لە ڕاســـتیدا ئەو پەیامەی بـــۆ دەنێریتو پێی دەڵێیت: کە ئەو گرنگییەکی وەهای لاتان نییە!

هەروەها ئەگەر هاوسەرەکەتان داوا دەکات کـــە کاتێکی زیاتر لای بمێنیتەوە، تۆ بەردەوام چـــاوت بڕیوەتـــە کاتژمێرو دەڵێیـــت: تەواوی کاتەکانم گیراوەو ئیشـــم هەیە، زۆر بە ڕوونی ئەو پەیامەی پێ دەدەیت کە بەشـــێك لە کاتی خۆتـــان بۆ ئەو تەرخان نەکـــردووە، کۆمەڵێك کارو شتی تر بە گرنگی ئەو دەگۆڕیتەوە! بەڵام ئەمە ڕواڵەتی کارەکەیەو لە ڕاســـتیدا بەشێکی زۆری کاتـــە گرنگەکانمان تایبـــەت کردووە بە فکـــرو خەیاڵـــە پـــەرشو بـــڵاوو نیگەرانییە جۆراوجۆرەکان کە نە هەســـتێکی باشـــمان پێ دەدەنو بۆ دەگوازنەوە، نە سوودێکیان هەیە.

بـــەڵام وەك ئـــەوەی کە هێزێکـــی نادیارو نەناســـراو هەبێت کـــە ئێمە ناچـــار بکات بۆ ئـــەوەی ئـــەو کاتـــە بە ســـوودەی خۆمـــان کە دەکرێت بۆ هاوســـەرو منداڵو ئازیزانمان بن، بۆ ئەو بیرکردنەوەو نیگەرانییە بێ ســـوودانە تایبەت بکرێن، بە جـــۆرێ کە ئەو دڵەڕاوکێو بیرکردنەوە نێگەتیڤانە بوونەتە کارو ئەرکێکی بەردەوام کە دەبێـــت ڕۆژانە بێ ئەم لاو ئەولا کاتێکـــی تایبەتیان بۆ تەرخـــان بکەین. بەڵام ئێمە هەمـــوو دەتوانین بە شـــێوازو ڕێگایەکی ســـادەو ئاســـان لە دەســـت ئـــەو بیرکردنەوە نەخـــوازراوو بێزارانە ڕزگارمـــان بێت، کاتێکی زیاتر بۆ ئارامیو خۆشـــی خۆمانو ئازیزانمان بە لاوە بنێین.

ئەم شێوازە سادەو زێڕینە تەرخان کردنی کاتێکی جیایە لە دەرەوەی ٢٤ کاتژمێری ڕۆژو شەو، تایبەتە بە هەستو بیرکردنەوە نەرێنیو ناخۆشەکان. ئەم کارە زۆر ئاسانە.

کاتێك نەمانەوێـــت کارێك ئەنجام بدەین چی دەکەین؟ ئاشـــکرایە، پشتگوێی دەخەینو بە بەکارهێنانی وشـــەی زانراوو ئەفســـوناوی "دوایی" ئەنجامدانی ئەو کارە هەڵدەگرین بۆ داهاتوویەکی نەزانراوو نادیار.

ئێمە کاتێك بە کارهێنانی وشەی "دوایی" تا ئەندازەی پسپۆڕی دەزانین، ئیتر بۆچی بە کەڵك وەرگرتن لێی نیگەرانیو دڵە خورپەکانی ڕۆژانەمـــان بـــۆ کاتێکـــی وەك کاتژمێـــر ٢٥ هەڵنەگرینو دوانەخەین؟

کاتژمێرێـــك کە تا ئەو کاتەی شـــەووڕۆژ بیســـتوچوار کاتژمێر بێـــت، هەرگیز نایەتو لەگەڵیـــدا ڕووبـــەڕوو نابینـــەوە، بەجـــۆرو هاوشێوەی کەســـانی ســـەرکەوتوو، بە تایبەت بەڕێوەبەرانی ســـەرکەوتوو کە کاتێك لە ژیانو کاتی ئـــەوان ورد دەبینەوەو ســـەرنج دەدەین، ئەوانیـــش وەکو منو تۆ بەشـــیان لە شـــەوو ڕۆژێکـــدا ٢٤ کاتژمێـــر زیاتر نییـــە، بەڵام بە شـــێوەیەکی زۆر ســـەیر بۆ تەواوی کارەکانیان وەختـــی تەواویان دەبێتو لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە کـــە زۆرترین کاتی دیـــارو گونجاویش لەگەڵ خێزانو منداڵەکانیان بە سەر دەبەن.

ڕازو نهێنی سەرکەوتنی ئەو کەسانە هەر ئـــەو کاتژمێـــر ٢٥یە کە تـــەواوی بیروخەیاڵە بێزارو هەستەناخۆشەکانی خۆیان بۆ ئەو کاتە هەڵدەگرن. کاتژمێرێك کە هەموو کات بڕیارە دواتر بێت، هیچ کات هەلی هاتن پەیدا ناکات، ئێـــوەش یەکجـــار کاتژمێر ٢٥ تاقـــی بکەنەوە، هێزی سەرسوڕهێنەری سەرسامتان دەکات.

نوسینی: Mary Lavordt
و: ئیمان ناصح



# گوڵدانی بیرەوەرییەکان



ڕۆژی دایکان نزیک ببووەوە، بیرم دەکردەوەو دەمگوت: ئاخۆ دایکم چی پێخۆش بێت بۆی بکڕم؟ پۆشاکو بابەتەکانی ترم لە ساڵانی ڕابردوودا چەندجار بۆ کڕیبوو.

هەر دیارییەك دەهات بە مێشکمدا بیرم دەکردەوە کە دووبارەیە، حەزم دەکرد دیارییەکی تایبەتی بۆ بکڕم، کە دووبارە نەبێت.. دوای هەندێك لە بیر کردنەوە بیرۆکەیەکی نوێ بە مێشکمدا هات، ئەو شتەی کە بەڕاستی دایکم دەیەوێت خۆشەویستیو هەستی کچەکەیەتی بەرامبەری.. ئەو تەواوی تەمەنی گەنجی خۆی بۆ منو لە پێناوی خۆشبەختی مندا بەسەر بردبوو، ماندوێتی زۆری چەشتبوو، لەبەرخاتری من وازی لە تەواوی خەونەکانی هێنا، ئەو فیداکارییانەی کە بۆ من ئەنجامی دابوو، ئەو نارەحەتییانەی ژیان کە بەسەریدا هاتبوو، لەبەر ئەوە دڵنیا بووم ئەو دیارییەی کە ئەو دەیەوێت هەر خۆشەویستیو وەفاداری جگەرگۆشەکەیەتی.

بۆ هەموو ئەو خۆشەویستییەی کە بە منی بەخشی بوو، ویستم سوپاسی بکەم!

چووم گوڵدانیکی داخراوم کڕی لەسەر پارچە کاغەزێك نووسیم: "گوڵدانی بیرەوەرییەکان"

بەو پارچە کاغەزە ڕووکاری دەرەوەی گوڵدانەکەم ڕووپۆش کرد، پاشان ١٠٠ پارچە کاغەزی بچووکم هێناو لەسەر هەریەکێکیان بیرەوەرییەکم لەسەر نووسیو هەمویم کردە گوڵدانەکەوە تا پڕ بوو، پاشان گوڵدانەکەم بردو لەسەر مێزی ژوورەکەی دایکم دامنا، کاتێك دایکم هاتە ژوورەوەو دیارییەکەی بینی لە ئامێزی گرت..

نووسینی سەر گوڵدانەکە سەرنجی ڕاکێشا بوو، بەڵام لە هیچ تێنەدەگەیشت، چاوەکانی بەرز کردەوەو سەیری کرد..

پێم گوت: سەری گوڵدانەکە بکەرەوەو پارچە کاغەزێك دەربهێنەو بیخوێنەرەوە..

کاتێك یەکەم پارچە کاغەزو یەکەم یادەوەری خوێندەوە، چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسك..

تیایدا نوسرا بوو: "هیچ کات ئەو ڕۆژە لە یاد ناکەم کە یەکەم پاسکیلت بۆ کڕیم، چەندە ڕەنگێکی جوانی هەبوو، ڕێك ئەوە بوو کە حەزم لێی بوو، نازانم چۆن سوپاست بکەم دایە گیان؟!"

دایکم دەستی برد تا دووەم پارچە کاغەز دەربکات. لەو کاتەدا پێم گوت: چاوەڕێ بە، هەر ڕۆژێك دەبێت تەنها یەك دانە بخوێنیتەوە.

بەڵام ئەو گوێی لێنەگرتەو دەستی کرد بە خوێندنەوەی دانە دانەی پارچە کاغەزەکان:

"لە تەمەنی ٩ ساڵیدا بووم، ئەو ڕۆژەم لە یادە کە بۆ نەشتەرگەری ڕۆیشتین بۆ نەخۆشخانە، چەندە دەترسام ئای دایە گیان تۆ لەو کاتەدا هاوڕێم بوویت"!

"لە دوای پێگەیاندنی ٦ منداڵ بیر لەو ئارامیو شیرینییەت دەکەمەوە کە چەندە خۆڕاگربوویت"!

"بیرم دێت کە بڕێك پارەم کۆکردەوە تا بەلەمێك بکڕم، بەڵام پارەکەم کەم بوو، تۆ پارەی ترت پێدامو بەلەمەکەت بۆ کڕیم، دایکە میهرەبانەکەم"!

لە دوای خوێندنەوەی چەندین یادەوەری، دایکم سەری هەڵبڕی، سەرەتا زەردەخەنەیەکی کردو پاشان دەستی کرد بە گریان!

"ڕۆڵەی شیرینم، ئێستاش وا خەریکی یادگارییەکم بۆ دروست دەکەیت کە هیچ کات لە بیری ناکەم، هەموو کات بیری ڕۆژی دایکانی ئەم ساڵ دەکەمەوە، هیچ کات لە یادم ناچێت"

بە وتنی ئەو قسانەی دایکم بیرم کردەوە کە هێشتا کات ماوە بۆ دروستکردنی یادگاری بەنرختر، لەو کاتەدا هەوایەکی پڕ خۆشیو خۆشەویستی باڵی بەسەر دایکمو منو تەواوی پارچە کاغەزی بیرەوەرییەکان کێشا بوو.



# خۆشم دەوێیت!

گۆران جەمیل

پەیوەندی نێوان ژنو مێرد ئەو پەیوەندییە ڕۆحییەیە کە لە ڕێگای خۆشەویستی هەمیشەییەوە دەکرێت بە زیندوویی ڕابگیرێت، ئەو خۆشەویستییەیش دەبێت لە هەڵسوکەوتیاندا ڕەنگ بداتەوە، بە شێوەیەك ڕۆچوبێتە ناو ناخیانەوە، گەیشتبێتە دوا خانەی لەشیان، ئاشکرایە یەکتر خۆشویستن بەوە نابێت کە هەر کەسەو لە ناخی خۆیدا ئەویتری خۆشبووێت، بەڵکو سروشتی مرۆڤ وادروستکراوە، ئارەزوو دەکات کە بزانێت بەرامبەرەکەی چەند خۆشی دەوێت، ئەمە زۆر بە چڕی لە نێوان هاوسەراندا بە دی دەکرێت، هۆی ئەوەش کە بۆ دەبێت خۆشویستنت دەربڕیت بۆ بەرامبەرەکەت؟

ئەوەیە کە زانینی ئاستی خۆشەویستی لە نێوان مرۆڤەکان بە گشتیو ژنو مێرد بە تایبەتی مەوەدەو بەزەیی زیاد دەکاتو دەبێتە هۆی چاوپۆشی لەو بابەتانەی کە لە سەری جیاوازن، هەروەها بەرگەگرتنی ناخۆشییەکانی ژیان لە بەر ئەو خۆشەویستییە، وا لە خوارەوە چەند ئامرازو ڕێگایەك دەخەینە ڕوو بۆ ئافرەتان، بۆئەوەی بتوانن نامەی پڕ لە میهرو سۆزو خۆشەویستی بگەیەنن بە هاوسەرەکانیان، هۆی ئەوەش کە بۆ ڕووی خامەمان بە تایبەتی لە ئافرەتانە؟ ئەوەیە کە سروشتی ئافرەتانو ڕۆڵیان لە خێزاندا وا دروستبووە کە سەرچاوەی خۆشەویستی، کانگای ئارامی، دابینکەری ژینگەی ڕۆمانسی ماڵەکانن:

١- ئەگەر هاوسەرەکەت سەرقاڵی خوێندنەوەیە، جاروبار گوڵێك بخەرە ناو کتێبەکەیەوە.

٢- کاتێك کە لە سەر کارەکەیەتی، کورتە نامەی پڕ لە سۆزو خۆشەویستی بۆ بنێرە.

٣- گەر شەربەتی پێشکەش دەکەیت، گوڵێکی جوان لە تەنیشت پەرداخەکەیدا دابنێ.

٤- جلەکانت زوو زوو بگۆڕە، هەمیشە هەوڵ بدە کە قژت بە شێوەیەکی نوێ دابهێنیت.

٥- ژووری نووستنەکەتان بۆنخۆش بکەو هەندێجار بە داگیرساندنی مۆم ڕووناکی بکەرەوە.

٦- با لە ژووری نووستندا شیعری خۆشەویستی هەڵواسرابێت.

٧- پێ دەچێت زۆرجار کێك دروست بکەیت، ئایا بیرت لەوە کردووەتەوە کە جارێك لە سەر کێکەکە بنووسی" خۆشم دەوێیت".

٨- کاتێك کە دەچیتەوە بۆ ماڵی باوکت پێی بڵێ کە پێت ناخۆشە کە لێی دوور دەکەویتەوە، بە دڵنیاییەوە زۆر بیری دەکەیت.

٩- ئافرەتێك دەڵێت: کاتێك هاوسەرەکەم هەڵدەستێنم بۆ نوێژی بەیانی، سەرەتا دەستەکانم دەشۆمو بۆنخۆشی دەکەم، پاشان زۆر بە نەرمی دەست بە دەمو چاو قژیدا دەهێنمو بە هێمنی بانگی دەکەم، بەم کارەشم وا دەکەم کە بۆنخۆشی من یەکەم شت بێت کە ئەو هەستی پێ بکات.

١٠- ئافرەتێکی تر دەڵێت: کاتێك هاوسەرەکەم دەڵێت: "دەچمە دەرەوە بۆ نانخواردن لەگەڵ هاوڕێکانمدا هیچت پێویست نییە؟" دەڵێم باشە بڕۆ بەڵام دوانەکەویت، چونکە کارەبا دەبڕێت، ئەویش سەری سوڕ دەمێنێو دەڵێت: کێ دەڵێ کارەبا دەبڕێت؟ منیش دەڵێم: من دەڵێم، چونکە بە چوونەدەرەوەی تۆ لە ماڵ هەموو شتەکان تاریك دەبێت، بە گەڕانەوەشت ڕووناکی دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەکەم، بزەیەکی کرد پاش ئەوەی کە زانی مەبەستم چییە، هاوسەرەکەم لە ماڵ دەرچوو، بەڵام زۆر تامەزرۆی گەڕانەوە بوو بۆ ماڵ.

١١- کاتێك کە سەفەر دەکات، کورتە نامەیەکی پڕ لە خۆشەویستی بخەرە ناو جانتاکەی، بۆی بنووسە تۆو مناڵەکان چەند تامەزرۆی بینینی دەکەنو ژیان بە بێ ئەو چ تەنیاییەکە.

١٢- پیاوان هەمیشە پێویستیان بە سۆزی لە بن نەهاتووی ئێوە هەیە، وا بکە کە هاوسەرەکەت دەگەڕێتەوە بۆ ماڵ پێشوازییەکی شاهانەی لێ بکەیت، بە ڕوویەکی گەشو شادییەوە بڕۆ پێشوازی لێ بکە.

١٣- لووتی هاوسەرەکەتو چاوەکانی، دوو ئەندامی زۆر هەستەوەرن، هەر بۆیە وا بکە بە خۆڕازاندنەوەو خۆ بۆنخۆشکردن، هەمیشە نامەی تازەبوونەوەی خۆشەویستی بۆ بنێریت.

١٤-خۆشویستنی کەسوکاری هاوسەرەکەت، بەڵگەی خۆشویستنی هاوسەرەکەتە، بەتایبەتی دایكو باوکی.

١٥- بیرت نەچێت کە زۆربەی پیاوان پێیان خۆشە کە بە نازناوێك بانگیان بکەیت، چونکە دووبارە ناو نانەوە واتای خۆی هەیە.

١٦- دەبێت بزانی حەزو ئارەزووەکانی چییەو بۆی دابین بکەیت، بۆ نموونە ئەو شرینییەی کە حەزی لێیەتی بیکڕەو پێشکەشی بکە، ئەمە وا دەکات کە بۆی دەر بکەوێت کە تۆ بایەخی پێ دەدەیت.

١٧- کە پیاوەکەت لە سەر کار بوو، هەوڵ بدە کە پێش گەڕانەوەی بۆ ماڵ تۆ ئیشو کاری ماڵت تەواو کردبێتو خۆتو ماڵەکەت ڕازاوەو بۆنخۆشکردبێت.

١٨- ناوە ناوە دیارییەکی بۆ بکڕەو پێشکەشی بکە، بەڵام لە کەشێکی ڕۆمانسیدا.

دیمەن حەیدەر



# ئەو کاتەی خۆشەویستی، لە ماڵەکانمان بار دەکات!

لە کاتێکدا خێزان بەردی بناغەی کۆمەڵگەیە، یەکێك لە گرنگترین بنەماکانی لە دەستدا، ئەوا بێگومان زەمینەیەکی لەبار بۆ هاتنە ناوەوەی چەندین کێشەو گرفتی ئاڵۆز دێتە کایەوە، کە هۆکاری خستنە قەیرانی زۆرینەی خێزانەکانە لە ئەمڕۆدا، سەرەنجام دەربازبوون لەو قەیرانە دەبێتە کارێکی زەحمەتو دژوار.

خۆشەویستی ئەو بنەما گرنگەیە کە بنیاتنانی خێزانی لەسەر وەستاوە، لە سەرەتاوە تا کۆتایی ژیان، ڕۆڵێکی سەرەکی دەگێڕێت لە کایەکانداو ڕادەی بەهێزیو لاوازی پەیوەندییەکانی ناوخێزانو تاکەکانی لەسەر وەستاوە، بەداخەوە زۆرینەی کێشەو ناخۆشییەکانی ناوخێزان، لە لاوازبوونی خۆشەویستیدا گەشەو نەشو نما دەکەن، پەیوەندییەکان بەرەو ئاڵۆزی دەبات، هەروەها بە هۆکاری سەرەکی تێکدانی شیرازەی خێزانی دادەنرێت، لەبەرئەوە گرنگترین خاڵ لە بە یەکگەیشتنی هاوسەراندا پێویستە ڕەچاو بکرێتو پەرەی پێ بدرێتو تا کۆتایی ژیان پارێزگاری لەمانەوەی بکرێت (خۆشەویستییە)! جا بە هەر ڕێگایەك لە ڕێگەکان بێت، بۆئەوەی بوار بدات بە بڵاوبوونەوەی لە ناوگشت تاکەکانی خێزانداو پاشانیش کۆمەڵگە بە گشتی.

بە پێچەوانەوە لە کاتی هەستکردن، بە لاوازی خۆشەویستی لە نێوان سەرۆك خێزانەکاندا، پێویستە ڕێگەچارەی تەواوی بۆ بدۆزرێتەوە، ئەگەرنا ڕێگە لە هێنانەکایەی منداڵ بۆ ناو ئەمجۆرە کەشوهەوا نالەبارە بگیرێت، چونکە لە هەموو بارەکاندا زەرەرمەندی یەکەم دەبێتو بە بێتاوان دەبێتە قوربانی دەستی ناکۆکییەکانی ناوخێزان کە ئەم دەستی لە دروستبوونیدا نەبووە.

لە زۆرینەی خێزانەکاندا ئەم گرفتە بڵاوەو بە دەستییەوە گیرۆدە بوون، کە چەندین کێشەی ئاڵۆزی تری بە دوای خۆیدا دروستکردووە، تەنانەت گەیشتووەتە ڕادەیەك کە دۆزینەوەی هۆکاری سەرهەڵدانی کێشەو گرفتەجۆربەجۆرەکان زەحمەت بووە.

هۆکارەکەشی ئەوەیە کە زۆربەی کات چارەسەری کێشەو گرفتە دەروونییەکان لەگەڵ پێداویستییە ماددیەکان تێکەڵ دەکرێنو ناتوانرێت لێکیان جودا بکەینەوە.

لە ڕاستیدا چارەسەرکردنی گرفتی دەروونی ڕێگایەکی زۆر جیاوازتری دەبێت، لە چارەسەرکردنی گرفتە ماددیەکان، بەم شێوەیەش هەڵە لە چارەسەرکردنی ناتەواوییەکانی خێزاندا ڕوودەداتو تێکەڵاویو نارِوونییەك لە هەڵسوکەوتەکانی سەرۆك خێزانەکاندا دروست دەبێت.

ئەوەی لێرەدا مەبەستمانە ئەوەیە کە گرفتە دەرونییەکان، کاریگەرییەکی ئێجگار قووڵو گەورەتریان لەسەر دەروونی منداڵ دەبێت، لە گرفتە مادییەکان، یاخود ڕاستر بڵێین: چارەسەرکردنی گرفتی دەروونی چارەسەرکردنی زۆرینەی کێشەکانی ناو خێزانە، چونکە بە ئاسوودەبوونی مرۆڤەکان لە ڕووی ڕۆحییەوە گرفتە مادییەکانیش ئەگەر هەبن بە شێوەیەکی سروشتی چارەسەر دەبن، لە حاڵێکیشدا

ئەگەر ئەو خێزانە نەداربن لە ڕووی داراییەوە، ئەوا بوونی خۆشەویستی بەپێز قەناعەتیان لا دروست دەکاتو دیارە قەناعەتیش خۆی لە خۆیدا گەورەترین سامانە، دەتوانین بڵێین زۆرینەی کێشەکان لە ئاست بوونی خۆشەویستیو دڵسۆزیدا چۆك دادەنو تەسلیم دەبن، خۆشەویستی دەرمانی هەموو دەردەکانە، ڕێگە چارەی ناکۆکیو ناخۆشییەکانە، کلیلی پێشکەوتنو سەرکەوتنو گەشەکردنو گەورەبوونی یەکەیەکەی تاکەکانی ناو خێزانە، بەڵام لە حاڵەتی نەبوونی خۆشەویستیدا خێزانەکان ڕووبەڕووی گرفتی زۆر دەکاتەوە، لێرەدا هەندێك لەو گرفتانە دەخەینەڕوو:

١- نەبوونی خۆشەویستی، دەبێتە هۆی دەمەقاڵەو ناکۆکی لە نێوان ژنومێردا، ڕووبەڕووبوونەوەی یەکتری لێدەکەوێتەوەو بە دووبارەبوونەوەی ئەم حاڵەتە لە پێش چاوی منداڵدا، مانایەك بۆ ڕێزگرتنیش نامێنێتەوە.

منداڵ بێزاری دایدەگرێتو وای لێدێت هەر یەك لە دایكو باوكی لەلا ئاسایی دەبێتەوە، چونكە حورمەتی خێزان کەوتۆتە مەترسییەوەو هێڵی سور لە بەرچاویدا شکێنراوە.

هەربۆیە لە هەموو حاڵەتێکدا باشترین ڕێگە ئەوەیە دەمەقاڵێو باسکردنو چارەسەرکردنی گرفتەکانی خێزان لە شوێنێکی دوور لە چاوی منداڵ بێت، لە پێناو پاراستنی بەهاو سەروەری خێزانو مانەوەی ڕێزگرتن وەکو قەڵغانێکی بەهێز، بۆ بەرگریکردنی خێزان لە دارمان.

٢- نەبوونو لاوازی خۆشەویستی ڕێگە بە تەشەنەکردنی لە نێوان تاکەکانی خێزانیشدا نادات، فێری خۆشویستنی یەکتری ناکرێن، بەمەش هاوسۆزیو یارمەتیدانی یەکتریو گیانی لێبوردن تیایاندا ئامادە نابێت، هەر تاکێك لە چوارچێوەی ئەو خێزانەدا لە هەوڵو دەستخستنو پاراستنی بەرژەوەندییەکانی خۆیدایە، نەك بەرژەوەندییەکانی خێزان، ئیدی لێرەوە قەوزا دروست دەبێتو کێشەکانی خێزان لە گرفت دەردەچنو دەچنە چوارچێوەی قەیرانەوە.

٣- گرنگی خۆشەویستی لە دەربڕیندایە، لەبەرئەوە لە حاڵەتی بوونی خۆشەویستیو دەرنەبڕینیدا، هیچ جیاوازییەکی نابێت لەگەڵ نەبوونیدا، ئەوەی پەیوەندییەکان بەهێزتر دەکات، بەخشینو گۆڕینەوەی هاوسۆزیو خۆشەویستییە لە نێوان ئەندامەکانی خێزاندا، تا فاکتەرەکانی تری وەك هاوخەمیو یارمەتیدانو هاندانو بەخشینو لێبوردەییو دەستخۆشی بەدوای خۆیدا دەهێنێت.

٤- لە حاڵەتی ڕێزنەگرتنی یەکتری لە لایەن دایكو باوكەوە، منداڵیش بە چاولێکردنیان ڕێزی ئەوانو هاوتەمەنو گەورەکانیش ناگرێت، ڕێزنەگرتنیشیان مانای گوێڕایەڵی نەکردنیانە، بە مانایەکی تر پەیڕەوکردنی هەر ئامۆژگاریو ڕێ نیشاندانێك لە لایەن دایكو باوكو گەورەکانەوە، ڕەت دەکاتەوەو بە بێ ئەزموون تەنها دوای ئیرادەو ویستو حەزەکانی خۆی دەکەوێت.

٥- خاڵێکی دی لەو کێشانەی کە ڕووبەڕووی خێزانی خاڵی لە خۆشەویستی دەبێتەوە، ئەوەیە کە هەر یەك لە ئەندامەکانی بە ئەرکی خۆیان هەڵناسنو جێبەجێی ناکەن، یان بە ناتەواوی کارەکانیان بەجێدەهێڵن، دایك ناتوانێت بە ئەرکی دایکایەتی خۆی هەڵسێت، چونکە متمانەی منداڵەکانی لە دەستداوە، هەروەها باوكیش لە حاڵەتی بێزاریو بوونی ئاژاوەدا ناتوانێت بە دڵسۆزییەوە کارەکانی ڕاپەڕێنێت، بە هەمان شێوە تەواوی ئەندامەکانی تری خێزانیش ناتوانن بە ئەرکی خۆیان هەڵسن.

لە حاڵەتی سەرزەنشتکردنیشیاندا لە لایەن کەسانی ترەوە، یەکتری تاوانبار دەکەن لەو کەموکورییانەی ڕووی تێکردوون.

٦- قسەوگفتوگۆ کە کلیلی چارەسەری زۆرینەی کێشەکانە نایەتەگۆڕێ، لە جێی ئەوە بێدەنگیو یەکتری قبوڵ نەکردنو کەڵەکەبوونی زیاتری کێشەکان جێی دەگرێتەوە، هەر یەك لە ئەندامەکان ئەگەر کێشەیەکی لە دەرەوەی خێزانەکەیدا بۆ دروست ببێت، ناتوانێت باسی لێوە بکاتو ڕای ئەوانی تری لەسەر وەربگرێت، چونکە لە بنەڕەتدا پەیوەندییەکی هاوڕێیان لە نێوانیاندا دروست نەبووە، بەمجۆرە وای لێدێت لە چارەسەرکردنی گرفتو داواکارییە کەسییەکاندا پەنا بۆ دەرەوەی خێزانەکەی دەباتو لەم پەنا بردنەشدا ڕووبەڕووی چەندین کێشەو گرفت دەبێتەوە، لە لایەن هاوڕێی نادڵسۆزو کەسانی هەلپەرستەوە ئیستغلال دەکرێنو بەرەو ڕێگەیەکی هەڵە پەلکێش دەکرێن.

٧- مرۆڤایەتی بە شێوەیەکی گشتی بە خۆشەویستی لە نێوان یەکتریدا دەتوانن درێژە بە مانەوەیان بدەن لە ژیاندا، لە هەر حاڵەتێکی کەمی، یا ئامادەنەبوونی لە ژینگەی منداڵدا کاتێك لە چوارچێوەی خێزانەکەیدایە، بۆشاییەکی دەروونی گەورە لە ناخیدا دروست دەکات، ناچار بەبێ ئاگا بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە دەروونییە پەنا بۆئەوە دەبات لە دەرەوەی خێزانەکەی بۆ ئاسوودەیی بگەڕێت، بە تایبەتی لە قۆناغێکی هەستیارو دیاریکراوی تەمەندا کە قۆناغی هەرزەکارییە، کە دواجار لە جێی ئەوەی چاوەڕوانی چارەسەربوونی کێشە دەروونییەکانی بێت، خۆی لە دەریایەك گێژاوی کێشەو گرفتدا دەبینێتەوە، کە باری سەرشانی ئەوەندەی تر قورستر دەکاتو ڕووبەڕووی لادانی کۆمەڵایەتی دەبێتەوە.

کە دواتر بە هۆی ئەو تێڕوانینە خراپانەی کۆمەڵگە بۆ کەسە لادەرەکان هەیەتی، تووشی گرێی دەروونی دەبێتو دووچاری بێهیوایی و ڕەشبینی دەبێت بەرامبەر بە ژیان.

٨- تایبەتمەندییەکی تری ئەو منداڵانەی کەموکوڕی سۆزدارییان هەیە، دروست نەبوونی قەناعەتە لە لایان، فەرامۆشکردنیان لە ڕووی دەروونییەوە وایان لێدەکات قەناعەتیان لا دروست نەبێتو بە داواکاریو بیانووی لە ڕادەبەدەر دەوروبەرەکەی بێزار بکات، لە هەر پڕکردنەوەیەکی زیاتری ماددیدا داواکارییەکانی کۆتایی نایەتو داوای زیاترو زیاتر دەکات، بۆیە لەم بارودۆخەدا پێویستە دایكو باوك ئاگاداربنو دەستبەجێ هەوڵی پڕکردنەوەی کەمووکوڕییە دەروونییەکانی بدەن، بە یاریکردن لەگەڵیداو دواندنو گوێ لێگرتنی، کێشەکان بەرەو چارەسەربوون هەنگاو دەنێن.

بەم شێوەیە ژیان لە وەها خێزانێکدا چەمکەکانی ئاسوودەییو حەسانەوەی دەروونی ون دەبنو منداڵ هەمیشە هەست بە ڕووخانو لاوازی قەڵاکەی دەوری دەکات، کە (دایكو باوکن)، ئیدی هەستدەکات مەترسی لەسەر دروست بووەو متمانەو باوەڕ بەخۆبوونی لاواز دەبێتو ئەو دایكو باوكەی کە دەبوو جێگەی شانازی ئەو ببوونایە ئێستە ناتوانن بەو جۆرەبنو خەمو خەمۆکی دایدەگرێتو لە کۆتاییدا هەموو ئەو کێشانەی کە باسمان کردنو بگرە زیاتریشی لێ دەکەوێتەوە.

لە کۆتاییدا دەڵێین: خۆشەویستی وشەیەکی سانایەو ڕێگاکانی بەدەستهێنانو فێربوونیشی زۆر ساناو سادەن، بە مەرجێك بۆ ماوەیەك دەستبەرداری هەندێکی کەم لە مافەکانمان بین، تا بارودۆخەکان ئاسایی دەبنەوە، ئەگەر بمانەوێت ڕزگارمان بێت لەو هەموو ئاڵۆزییانە، پێویستە کەمێك قوربانی بدەین، تا دواجار بتوانین تاکێکی تەندروستو بنیاتنەر، وەك خەڵاتێك پێشکەش بە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بکەین.

هێشتا هاوسەرگیریم نەکردووە

# لە خوازبێنی ئەترسم

و: فیردەوس حەسەن

دایکم ڕقێکی تایبەتی لە هاوسەرگیری هەبوو، لەو کاتەوەی کە منو براکەم (نەوید) منداڵ بووین، (نگین)ی خوشکە گەورەمانی پیشان دەداینو دەیگووت: نگین ئێمەی بەدبەخت کرد، لەوانەیە ئێوەش نگینێکی تر بەدبەخت بکەن، هاوسەرگیری واتە بەدبەختی.

کاتێک کە گەورەبووم، ئینجا لە قسەکانی دایکم تێگەیشتم، ئەو شەش ساڵ دوای هاتنە دونیای نگینو دوای ١٢ ساڵ ژیانی هاوبەش لە باوکم جیا ببووەوە، لە ڕاستیدا باوکم ئەوی تەڵاق دابوو، هەرچەند دایکم لێی پاڕابووەوەو خزمەکانیشی تکایان لێکردبوو، هیچ سودێکی نەببوو، باوکم وتبووی: ئەم ژنە ئێمەی بەدبەخت کردووە، ئەو بە کەڵکی من نایەت، دوای ئەوەی منیش تەڵاقمدا لەگەڵ هەرکەسێکی تر زەماوەند بکات بەڕۆژی ڕەشی دەگەیەنێت.

من ئەو کاتە منداڵێکی ٣-٤ ساڵان بووم، تەنها لە شێوازی قسەکردنی باوکمەوە کە سور هەڵدەگەڕاو توڕە دەبوو، تێدەگەیشتم کە ئەو قسانە هاوڕێیانە نییە، ئەگینا خۆ نەمدەزانی بە ڕۆژی ڕەش گەیاندن مانای چییە.

من هەندێ جار لە دایکمم دەپرسی: باوکم بۆچی تۆی تەڵاقدا؟

ئەو سەرەتا هیچی نەدەگوت، بەڵام کاتێک کە پێم خستە ئامادەییەوە، بە وتەی خۆی باشو خراپی خۆمم لێك جیا دەکردەوە، ڕۆژێك هەموو شتێکی بۆ باسکردم: منو باوکت هەردووکمان لە کارخانەیەکدا کارمان دەکرد، هەردووکمان لە خانەوادەیەکی مامناوەندو قەرەباڵغ بووین، باوکت عاشقی من ببوو، لەگەڵ خانەوادەکەی هاتنە خوازبێنیم، هەموو شتێك زۆر خێرا بەڕێوەچوو، نە ئێمە سەختگیریمان کردو نە ئەوانیش، ژیانی هاوسەریمان بە خۆشەویستیو میهرەبانییەوە دەستی پێکرد، کاتێك نگین هاتە دنیاوە وامان دەزانی لەم دنیایەدا کەس لە ئێمە خۆشبەخت تر نییە، بەڵام ئەو نەخۆش بوو، بیرکۆڵ بوو، من خۆشم دەویست، ئێستاش لە ئێوە زیاتر خۆشم دەوێت، بەڵام باوکت هەرجارەو بیانوویەکی دەدۆزییەوە، بەخێوکردنی کەسێکی لەو شێوەیە خەرجی داوو دەرمانەکانی زۆر قورس بوو، هەربۆیە بەردەوام تانەی لێ دەدام:

-ئەگەر من بمزانیایە ئەم منداڵە دەهێنیتە دنیاوە، هەرگیز هاوسەرگیریم لەگەڵدا نەدەکردیت، خۆزگە بە باشی لێکۆڵینەوەم دەربارەی خانەوادەی ئێوە بکردایە، ئەو کات دەمزانی کە پوریشت منداڵێکی لەم شێوەیەی هەیە، باوکت ڕازی نەبوو یەك فلسیش خەرج بکات بۆ نگین، هەموو ڕۆژێك شەڕمان بوو، بێزار ببووم، باوکت لە جیاتی ئەوەی لە بەرامبەر کێشەکاندا هاوکاری من بکات، دژایەتی دەکردم، ئەگەر بڵێم نامەردبوو، هێشتا کەمم وتووە، بە هەرحاڵ دوای ماوەیەك کارمان گەیشتە تەڵاقو جیابوونەوە، ئەو نەك بەخێوکردنی تەنها نگینی لە خۆ نەگرت، بەڵکو بەخێوکردنی تۆو نەویدیشی خستە ئەستۆی من.

بەڵام بە هەرجۆرێك بوو ڕۆژێك گرنگترین پرسیاری ژیانمم لێکرد:

- بۆچی ئەڵێی هاوسەرگیری مەکە؟

چاوەکانی دایکم پڕبوون لە فرمێسك، کەمێك سەری بەرز کردەوەو ئاهێکی هەڵکێشا!

بۆئەوەی کە بە چارەنووسی من نەگەیت، نیگاگیان.

به سەرسوڕمانەوە پرسیم یانی چی؟

واتە ئەگەر منداڵێکی وەکو نگین بێنیتە دنیاوە ئەو کات چی؟

ڕەنگم پەڕی: بەڵام.. قسەکەی پێ بڕیم: بەڵاو ئەگەری تیا نییە، بەهەرحاڵ دەبێت ئەگەری ئەوە دابنێیت کە یەکێك

له منداڵەکانی تۆش بیرکۆڵ دەبێت، ئایا تەحەممولی دەکەیت؟ ئایا هاوسەرەکەت هەمان بەڵای منت بەسەردا ناهێنێت؟

قسەکانی دایکم ژیرانەبوو، بەڵام نەمدەویست ڕاستییەکە قبوڵ بکەم، حەزم دەکرد وا خۆم دەرخەم کە هیچ شتێك ڕوونادات، لەبەرئەوەش بە زەردەخەنەیەکی دروستکراوەوە وتم: جا کێ دەڵێ منداڵی من وادەبێت؟ دوای ئەوە بە ویستی خودا هاوسەری ئایندەی من کەسێکی ژیرو تێگەیشتوو دەبێت، دیسان قسەکەی پێ بریمو ئەمجارە بە توندی هاواری کرد بەسەرمداو وتی: من هەر سەرەتا هەموو ڕاستییەکی پێ دەڵێم...

- بە کێ؟

- بەو کەسەی کە دێت بۆ خوازبێنیت، ئەو دەبێت هەر لەسەرەتاوە هەموو شتێك بزانێت، نیگا.

بەڵام... ئەوەندە مەڵێ، بەڵام هەرچی بێت زۆر لەوە باشترە کە دوایی بزانێتو کارتان بە تەڵاقو جیابوونەوە بگات.

دیسانیش دایکم ڕاستی دەکرد، من دەبێت ئازایانە هەموو شتێك بڵێمو مافی هەڵبژاردن بە خوازبێنیکارەکەم بدەم، بەڵام، نەمدەزانی ئەم کارەم چەندە قورسو نائومێدکارە.

من داواکاری زۆرم نەبوو، ئەوانەش کە هەبوون کەسانێك بوون کە هاوشێوەی خۆم بوون، یان منداڵی دایكو باوکێکی جیابووەوە بوون، یان بە کورتی ژیانو گوزەرانیان لە من باشتر نەبوو، یەکەمین کەسێك کە هاتە خوازبێنیم سوهراب بوو، لە تەمەنی ٦-٧ ساڵیدا باوکی لە دەست دابوو، خوێندکاری بەشی ئەندازیاری بوو، پێش ئەوەی بێتە خوازبێنیم بە دایکمم وت: لانی کەم شەوی خوازبێنی بابەتەکەی نگینیان پێ مەڵێ....

ئەی کەی پێیان بڵێم؟

دواتر بە ئارامی پێیان بڵێ..

-نا شتی وانابێت، لەوانەیە ئەگەر لەوەوپێش کێشەی نگینیان بزانیایە هەر نەهاتنایەتە خوازبێنیت. قسەکانی دایکم ئەگەرچی ژیرانە دەهاتە پێشچاو، بەڵام نیگەرانی منی زیاتر دەکرد، ئەوەندە دووچاری دڵەڕاوکێ ببووم، کە ئەو ٣-٤ ڕۆژە تەواو لە خەوو خۆراك کەوتبووم، تا ئەوەی کە شەوی خوازبێنی گەیشتو سوهرابوو خانەوادەکەی هاتن، دوای یەکتر ناسینی هەردوو خانەوادەکە دایکم بە پێشەکییەکی کورت هەموو شتێکی بە ئەوان گوت، نگینیشی پیشانی ئەواندا، سوهراب سەری سوڕمابوو، دواتر پرسی کەسێکی تر هەیە لە خانەوادەکەتان بەم شێوەیە بێت؟

پێش ئەوەی دایکم وەڵام بداتەوە من وتم: نەخێر، بەڵام دایکم ئاهێکی هەڵکێشاو: منالی پوریشم هەمان نەخۆشی هەیە، سەرسوڕمانو نیگەرانی سوهرابوو خانەوادەکەی زیاتر بوو، دوو سێ پرسیاری تریان کردو ڕۆیشتن. دوای ڕۆیشتنی ئەوان زۆر گریام..

بۆچی دایە، بۆچی هەموو شتێکت تێکدا؟

- خراپم کرد؟ چاوەڕێبووی درۆیان لەگەڵدا بکەم؟

نا، بەڵام دەمان توانی دواتر پێیان بڵێین، قسەکردنی منو دایکم بێ سود بوو، ئەو دڵسۆزانە دەیگوت کە نایەوێت دووچاری چارەنووسی ئەو ببم، دەرکم بەوە دەکرد بەڵام.. بە هەرحاڵ سوهراب ڕۆژی دواتر تەلەفۆنی کردو وتی: مۆڵەتم بەرێ کەمێك بیر بکەمەوە، دیاربوو کە خانەوادەکەی ئەم هاوسەرگیرییەیان لێ قەدەغە کردبوو، سوهراب دەیگوت: من دەمەوێت هاوسەرگیری لەگەڵ کچێکی ژیرو ڕەوشتبەرزی وەك تۆدا بکەم، بەڵام ناتوانم دەست لە خانەوادەکەم هەڵگرم، دوای ماوەیەك سوهراب ڕاشکاوانە وتی: نیگاخان لە ڕووی پزیشکییەوە ئەگەری ئەوە هەیە کە یەکێك لە منالەکانی ئێمەش بەم شێوەیە بێت لەبەرئەوە....

ئەو مافی خۆی بوو کە ئەو کارە نەکات، بەڵام تاوانی من چی بوو؟ گەڕانە دواوەی سوهراب کاریگەری خراپی هەبوو لەسەرم، باوەڕم بە خۆم نەمابوو ئەوەندە عەصەبی ببووم، هەندێجار خۆشەویستیم بۆ نگین زۆر کەم دەبووەوە، گۆڕابووم بۆ کچێکی تووڕە، جاروبار دەم بیست دەیانگوت ئەگەر نیگا هاوسەرگیری بکات، ئەو تووڕە بوونەی نامێنێت!

دوای ئەوە کوڕێك بە ناوی سەعید، هاتە خوازبێنیم، پێشتر بە هیچ شێوەیەك نەمدەناسیو تەنانەت نەشم بینی بوو، بە ڕواڵەتیدا کەسێکی باش دیار بوو، دەرچووی زانکۆ بوو، لە کۆمپانیایەك کاری دەکرد، خاڵی هاوبەشی منو ئەو ئەوەبوو کە ئەویش برایەکی هاوشێوەی نگینی هەبوو، دایکم بە زەماوەندی ئێمە ڕازی بوو، بەڵام من مۆڵەتم وەرگرت کە بیری لێ بکەمەوە، لەو ماوەیەدا ڕاوێژم بە زۆرێك لە دۆستانم کرد، تەنانەت ڕاوێژم بە چەند پزیشکێکیش کرد، پزیشکێك پێی وتم:

ئەگەر تا پێش ئەمە ئەگەری ئەوە هەبووە کە منالی تۆ ١/٣ بیرکۆڵ بێت، ئەوا بە هاوسەرگیری لەگەڵ ئەم کوڕەدا بە لایەنی کەمەوە دەگاتە نیو بە نیو، بەشێوازێکی تر ئەگەر ٤ منالتان ببێت ڕەنگە دوانیان بیرکۆڵ بن.

چەند مانگێك بەسەر خوازبێنی سەعیددا تێپەڕیوە، من دوودڵم، تازە دڵنیاشم ئەگەر هاوسەرگیری نەکەین باشترە، بەڵام من لە ناخەوە زۆر دەترسم، بە تایبەت لە کاتێکدا کە زانستی پزیشکی ئەوەندە پێشکەوتووە دەتوانێت ئەگەرەکان لێك بداتەوە، ئایا هاوسەرگیرییەکی لەم شێوەیە ژیرانەیە؟

ماوەیەك دوای ئەوەش کەسێکی تر هاتە خوازبێنیم، ئەمیان بە شێوەی زگماکی ناتەواوی جەستەیی هەبوو، دەیگوت: بەلامەوە گرنگ نییە کە منالەکانمان ناتەواو بن، من نەوەکانی ئایندەمانم لە گیانم زیاتر خۆشدەوێن، نازانم چی بکەم، بەڕاستی هەر بە دوودڵی ماومەتەوە...

بیروڕای دەروونناسان دەربارەی ئەم بابەتە:

زانستی پزیشکی زۆر بە ئاسانی دەتوانێت ئایندەی کۆرپەلەو تەنانەت پێشبینی کەموکوڕی کرۆمۆسۆمەکان بکات، هەرلەبەرئەوە نیگا دەتوانێت بەشێوازێکی ژیرانەو بە وریاییو بە خەیاڵێکی ئاسودەوە هاوسەرگیری بکات، (لێکۆڵەری بۆماوەزانی)ش پێش هاوسەرگیری پارمەتییەکی گەورەیە بۆ کوڕانو کچان کە دڵنیابن لە سەلامەتی منداڵی داهاتوویان.

نیگاخان لە جیاتی ئەوەی خەمی هاتنەدنیای منداڵێکی ناتەواو بخوات، بە هۆی هەندێك لە بیرکردنەوە هەڵەکانی خۆیو دایکییەوە، ئەو دەبێت باوەڕی بە خۆی هەبێتو لە کاتی وتنی ڕاستییەکان بە خوازبێنی کارەکانی (لێکۆڵەری بۆماوەزانی)یش لە یاد نەکات.

سەرچاوە/ روزهایی زندگی

# دوای تەڵاق

# لە پایتەخت چاوم بە دنیا هەڵهێنا!



وەك لە سەرەتاوە ئاماژەمان بۆ کرد، گۆشەی دوای تەڵاق باس لە ژیانی ئەو هاوسەرە سەرکەوتووانە دەکات کە توانیویانە بۆ جاری دووەم لە پرۆسەی هاوسەرگیریدا سەرکەوتوو بنو ژیانێکی ئاسوودەو ئارامو پڕبەختەوەری بۆ خۆیانو منداڵەکانیان فەراهەم بهێنن، بە پێچەوانەی ئەو بیروبۆچوونانەی کە پێیان وایە ئەگەر مرۆڤ لە پرۆسەی یەکەمی هاوسەرگیریدا شکستی هێنا، ئیدی دەرفەتی هەستانەوەی نامێنێت..

بەر لەوەی باس لە چیرۆکی ئەم جارە بکەین، سەرەتا ئاماژە بە سەرەکیترین ئەو خاڵانە دەکەین کە دەبنە هۆی جیابوونەوەی هاوسەران، چونکە مرۆڤ ئەگەر دەستنیشانی ئەو هۆکارانەی نەکرد کە لە جاری یەکەمدا بووەتە هۆی لە یەکهەڵوەشاندنەوەی ژیانی هاوسەریی، ئەوا دوور نییە جارێکی دیکەش دووچاری هەمان چارەنووس ببێتەوە..

هەروەها بۆ ئەو خوشکو برایانەش کە ئێستا لە ژیانی هاوسەریدانو کێشەکانیان گەیشتووەتە بینەقاقایان، یاخود ئەو بەڕێزانەی بۆ یەکەمجار بە نیازن بچنە نێو ئەم پرۆسەیەوە، پێویستە هۆکاری سەرەکی کە دەبێت، یان بووەتە هۆی جیابوونەوەی هاوسەران لە یەکدی بە بیرخۆمان بهێنینەوە:

بە وتەی توێژەرەوانو ئەزموونداران، هۆکاری سەرەکی جیابوونەوەی هاوسەران دەگەڕێتەوە بۆ ئەم خاڵانەی لای خوارەوە:

١- جیاوازی ژینگەو ژیانی کۆمەڵایەتی: بۆ نموونە کچەکە خەڵکی شارەو کوڕەکەش خەڵکی گوندێکی دوور، یا بەپێچەوانەوە.

٢- ناپاکی هاوسەری: چ لە لایەن پیاوەوە بێت، یاخود ئافرەتەوە.

٣- ئیرەیی بێ سنوور: ئەم خاڵە بە زۆری ئافرەتان دەگرێتەوە.

٤- ڕژدیو چروکیو ڕەزیلی: ئەم خاڵەش بە زۆری پیاوان دەگرێتەوە.

٥- جیاوازی لە ئاستی ڕۆشنبیریو پلەی خوێندندا.

٦- جیاوازی ڕەگەز، پیاوەکە خەڵکی کیشوەرێکەو ئافرەتەکەش کیشوەرێکی دیکە..

٧- لە خۆباییبوونو خۆبەزلزانین، بە تایبەت بە هۆی سەروەتو سامان، یان پلەو پایەو دەسەڵاتەوە.

٨- گۆڕانی لە ناکاو، بۆ نموونە پیاوەکە تووشی ئالوودە بوون بە مادەی هۆشبەر، یان تووشی لادانی ڕەوشتیو ئاینی دەبێت.

٩- زۆرجاریش کێشەکان شتی زۆر سادەو ساکارن، لە ئەنجامی گوێنەگرتن بۆ یەکتری ناچار بە جیابوونەوە دەبن.

لێرە بەدواوە هەوڵ دەدەین بە پشتیوانی خودا بۆ هەر یەك لەم خاڵانەی سەرەوە ژیانو بەسەرهاتی کەسێك باس بکەین، کە یەك لەو خاڵانە بووەتە هۆی جیابوونەوەیانو پاشان توانیویەتی لە جاری دووەمدا بە ئەزموونێکی زۆر باشەوە ژیانێکی ئاسوودە فەراهەم بهێنێت..

لە یەکەم چیرۆکدا باس لە هۆکاری جیاوازی ژینگەو ژیانی کۆمەڵایەتی دەکەین.. چیرۆکەکە بەم شێوەیە دەست پێ دەکات..

تەمەنم بیست ساڵان بوو، خەڵکی پایتەخت بووین، ژیانو گوزەرانی منداڵیم تا ئەو تەمەنە لە نێو کوچەو کۆڵانو خوێندنگەکانی پایتەختدا بەڕێ کردبوو، بۆ من شتێکی لە ناکاو بوو، کوڕی خاڵەکەم ناردییە خوازبێنیم، ئەوان خەڵکی یەکێك لە گوندە دوورەکان بوون، نازانم چۆن بوو، کاتێك دایکم وتی: خەندە گیان ماڵی خاڵت هاتوونەتە خوازبێنیت، دەیانەوێت ببیتە هاوسەری ئەردەڵان؟ بێ دوودڵی بە بەڵێ وەڵامم دایەوە، هەرچەندە من سەبارەت بە لادێو ژیانو گوزەرانی لادێ هیچ شتێکم نەدەزانی، بە درێژایی ژیانم تەنها شەوێکیش لە لادێ نەمابوومەوە، وامدەزانی لادێ واتە گەشتو گوزارو سەردانی خزمو کەسوکارو چێژ وەرگرتن لە دیمەنی جوانیو سروشتەکەی.

بە هەرحاڵ ڕێورەسمی پرۆسەی هاوسەرگیری بە ئەنجام گەیشت، پاش بەسەربردنی مانگی هەنگوینی، هاوسەرەکەم بۆ پەیداکردنی بژێوی ژیانمان ڕوویکردە شارو لەوێ کارێکی گونجاوی دەستکەوت، بەڵام بە بیانووی ئەوەی کرێ خانوو گرانەو داهاتەکەی بەشی کرێ خانوو ناکات، هەروەها نابێت دایکو باوکی تەنها جێبهێڵێت، دەبوا من لە گوند بمێنمەوە، لەسەر ماڵی خاڵم کە خەزووریشم بوو، هاوسەرەکەشم هەفتانە دەگەڕایەوە بۆ لامان..

هێشتا چەند مانگێك بەسەر ژیانی هاوسەریماندا تێنەپەڕی بوو، کێشەو دەمەقاڵێی نێوانمان یەکجار پەرەی سەند، هەوڵی کەسوکارمان بۆ دواخستنو پەشیمان بوونەوەمان لە تەڵاق بێ ئاکام بوو، من سووربووم لەسەر ئەوەی دەبێت تەڵاق وەربگرم، سەرەنجام جیابووینەوە، منیش بە خۆشحاڵییەوە گەڕامەوە بۆ ماڵی باوکم، وا هەستم دەکرد لە زیندان ئازاد بووم، نەك پەشیمان نەبووم، بەڵکو زۆریش خۆشحاڵ بووم، چونکە تێگەیشتنو پێکەوە ژیان لەگەڵ ئەردەڵاندا زۆر زەحمەت بوو..

هێشتا ساڵێك بەسەر جیابوونەوەم لەگەڵ ئەردەڵاندا تێنەپەڕی بوو، مامۆستایەك کە ئەویش لە پرۆسەی یەکەمیدا لەگەڵ خێزانیدا سەرکەوتوو نەببوو، ناردبویە خوازبێنیم، بیرم چوو بڵێم مامۆستا لە خێزانی یەکەمی کچێکی هەبوو، یەکێك لە مەرجەکانی ئەوەبوو کە دەبێت ببمە دایکێکی میهرەبان بۆ کچەکەی، منیش لەبەرئەوەی هەم مامۆستا کەسێکی میهرەبانو ڕۆشنبیر بوو، هەم بەزەییم بە کچەکەیدا دەهاتەوە، پێشنیارەکەیم قبوڵ کرد.

ئێستا لە کاتی نووسینەوەی چیرۆکی ژیانی خۆم، چەند ساڵێك بەسەر ژیانی هاوسەری منو مامۆستا هیوادا تێپەڕیوەو دوو منداڵی جوانمان هەیەو ژیانێکی زۆر ئاسوودەو ئارام، پێکەوە دەگوزەرێنین، سەرەڕای ئەوەش هیچ جیاوازییەك لە نێوان منداڵەکانی خۆمو منداڵی خێزانی پێشووی هیوادا ناکەم..

**دەروونناسان دەڵێن:**

سەرکەوتنی ئەم خاتوونە لە پرۆسەی دووەمی هاوسەرگیریدا بۆ ئەم خاڵانە دەگەڕێنەوە:

١- بروا بەخۆبوونو گەشبینی بە ژیان.
٢- هەڵبژاردنی گونجاو لە جاری دووەمدا.
٣- پەند وەرگرتن لە هەڵەکانی ڕابردوو.
٤- نەرمونیانیو مامەڵەکردنی ژیرانە لەگەڵ هاوسەری دووەمیو منداڵەکەیدا.

بێگەرد فارس

# ئەو زەمانانەی ڕاستبێژن!



**زمانی گوڵ**

نەرمترین پەڕەو جوانترین زمانە، بۆ دەربڕینی مەودای هەستەکان، بۆ ئەوانەی خۆشمان دەوێن لە هەموو بوارەکاندا، خۆشەویستی، دڵخۆشی، دڵتەنگی، نازانو لێی تێناگەن، کەسانێکی کەم نەبێت، ئەوەش ئاماژەیە بۆ هەستی جوانو نەرمو نیان.

**زمانی چاوەکان:**

زمانی چاو، ڕەنگدانەوەی ئەو هەستانەیە کە لە ناخو دڵی هەرکەسێکدایە، ڕوانینەکانی باس لە کەسایەتی خاوەنەکەی دەکەن کە لە هەموو وشەکان بەهێزترە، ژمارەیەکی کەمی خەڵك دەتوانن لەو زمانە تێبگەن.

**زمانی دڵەکان**

زمانی دڵ هەندێجار بەوپەڕی نەرمی بە گوێی خاوەنەکەیدا دەچرپێنێو هەندێ ساتیش بە توڕەبوون، چونکە زۆر ڕوونە لە دەربڕینەکانی هەرچەندە داپۆشراوە، هیچ کەسێك بێجگە لە خۆت ناتوانن ئەوەی لەناو دڵتدایە ببینن، بەڵام ئەگەر بە ڕاستگۆیانە خۆشەویستی بکات ئەوا خاوەنەکەی لە لوتکەی بەخشیندا دەبێت بۆ ئەوانەی لە دەوروبەریدان.

**زمانی ئارامی**

ئەوە حاڵەتێکی دەروونی باشە، باس لە کەسایەتییەك دەکات بەوەی کەسێکی ئارامو هەستیارو هەست ناسکە، ئەگەر بۆ ساتێك بێ هیوایی سەردانی بکات، بەشێوەی شەپۆلێکی جوڵاو تێپەڕ دەبێت تەنها بە بوونی میوانی دڵە خۆشویستراوەکەی. چەندە جوانە ئارامیو لەسەرخۆیی!

**زمانی بێدەنگی**

هیچ زمانێك هێندەی ئەم زمانە بەهێز نییە، زمانێکە بێجگە لە زیرەکو بەهێزەکان نایزانو لێی تێناگەن، ئەوانەن کە دەزانن چ کاتێك دەبێژنو چ کاتێکیش بڕیاری بێدەنگی دەدەن! ئەوە زمانی عەقڵە، زۆربەی کاتەکان بێدەنگی ڕەوانترینو بەهێزترین زمانە.

**زمانی زەردەخەنە**

زەردەخەنە بە یەکێك لەو زمانانەی جەستە دەژمێردرێت کە خوای گەورە بە ئەوەی ئادەمی بەخشیووە!

زەردەخەنە ڕێگەیەکی کورتە بۆ بەدەستهێنانی دڵەکان، دەروازەیەکە بۆ شکاندنی ڕێگە بەفرینەکانو بە چەشنی تیشکە زێڕینەکانی خۆر دەیان توێنێتەوەو بە دەربڕینێکی ڕاستگۆیانەو ڕەونەقێکی جوان، هەڵهاتنی هیوایەکە خاوەنەکەی دەرازێنێتەوە.

**زمانی منداڵ:**

منداڵان لوتکەی بەرائەتو دەموچاوی سپیو نورانیو دڵەکانیان پاکو بێ خەوشن، زەردەخەنەی ژیانو هیواو ئومێدی داهاتوون، ئەوان پاکو بێگەردترینی دروستکراوانی ئەم گەردوونەن، ئەوەندە بەسە کە خۆشەویستی خوای گەورەن!

شێخانی



# ئێوه له دڵی بڕیاردا

لەگەڵ سپێدەی ٢٠ ئایاری هەموو ساڵێکدا، کە چەپکە گوڵەکانی ئێوەم پێ دەگات، کە وتە ئەرخەوانییە جوانەکانی ئێوە پەپوولەئاسا لەسەر لێوەکانتانەوە دەفڕێو لەسەر پەڕەی گوڵزاری هەمیشە بەهاری بڕیار دەنیشنەوە.

ئەو کات نازانم چ وتەیەك هەڵبژێرم، بۆ گوزارش لە هەستی پڕ سۆزو سوپاسو نەوازشم، هەرچەندە هەموو مانگێك بە (٤٨) لاپەڕەی ڕەنگاوڕەنگ، بە پەیڤی جوانو چرپەی ناسك ڕۆحتان دەدوێنم، بەڵام کاتێك بەرامبەر هەستو خۆشەویستی ئێوە دەمەوێت شتێك بڵێم، دەستەوەستانم لە هەڵبژاردنی ڕستەیەکدا کە سوپاسی ئێوەی پێ بکەم.

دەبینم ئێوەی ئازیز، چەندە بە نازەوە لە ئامێزم دەگرن، بە ئەسپایی لاپەڕەکانم هەڵدەدەنەوەو پاش خوێندنەوەم لە شوێنێکی بەرزدا لە کتێبخانەکەتانم دادەنێن!!

خۆشەویستانم: من لە نێو دڵی ئێوەدا دەژیم، لەگەڵ خەندەکانتاندا پێدەکەنم، بە سڕینی فرمێسکەکانتان هێندەی هەموو دنیا خۆشحاڵ دەبم، بەلاچوونی تەمی بێهیوایی سەرسۆمای چاوەکانتان من ڕۆحم ئاسوودە دەبێت، کاتێك دەبینم دەستەکانتان لە ملی ئەژنۆکانتان کردووەتەوە، لەسەر لووتکەیەکی بەرزەوە بەرەو ئاسۆیەکی ڕوون دەڕوانن، منیش هەموو خەمەکانی خۆم بیردەچێتەوە!

ئازیزانم، دەزانن جوانترین خەندە، ئەو خەندەیەیە لە گەرووی ناخێکی پڕ هەنیسکەوە هەڵدەقوڵێ، وانەزانن لەودیوی ڕەنگی ئاڵو واڵای بڕیارەوە، هیچ خەمو پەژارەیەك بوونی نییە!

بەڵکو ئێمە لە پێناو خەمی ئێوەدا خەمی خۆمان لە یاد دەکەین، بۆئەوەی هەمیشە بە بەرگێکی ڕازاوەوە میوانتان بین، ماندووبوونو گرفتەکانی خۆمان وەلا دەنێین.

هاوڕێیان، کاتی ئەوە هاتووە، کە هەموو یەکێك لە ئێوەش هێندە گەورە بێت، کە نەك هەر تەنها بۆ خودی خۆیو حەزوو ئارەزووەکانی خۆی نەژی، بەڵکو لە ئاستی لێپرسراوێتیدا بێت، کە خەمی وڵاتو نەتەوەو دەوروبەری هەڵگرێتو بۆ ئاسوودەیی مرۆڤەکان بە پەرۆشبێتو هەوڵبدات پەیامبەری خێروخۆشیو خۆشەویستی بێت.

سوودگەیاندن بە دەوروبەر بە ئەرکی خۆتان بزانن، درك بەوە بکەن کە هیچ کارێك بێ ماندووبوون نایەتە بەرهەم، پرۆژەگەورەکانیش ماندووبوونو لێبڕانی گەورەیان دەوێت!

دەبا دۆستانو خۆشەویستانی بڕیار، وانەکانی بڕیار بکەنە کردارو بە بیری وردو هزری بەرزەوە بێنە مەیدان.

ڕامەوەستن، دوامەکەون، کوردستان چاوەڕوانتانە!!